# وتەی ناوداران



محمد(د)
امام عەلی
سوقرات
نیچە
دیل کارنگی
شکسپیر
البێرکامۆ
ژان ژاك رۆسۆ
ئەرستۆ
ناپلیۆن
جبران خلیل جبران

ئامادەکردنی:
هاوار عبدالرحمن بازیان

چاپی شەشەم
2013

## لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە 27



ناسنامەی کتێب

# وتـــەی نـــــاوداران

ئامادەکردن و وەرگێڕانی: هاوار بازیان

نەخشەسازی ناوەوە : جەمال لەتیف

دیزایینی بەرگ: فواد کەولوسی

تیراژ: 1000

نۆبەتی چاپ: چاپی پێنجەم

ساڵی چاپ: 2012

شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج

ژمارە سپاردنی: "59"ی ساڵی "2005"ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

ناونیشان

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: "07701574293" "07501191847"

# پێشەکییەك بۆ چاپی نوێ:

پێشوازیکردنی بەرچاو لەو کۆکراوەی "وتەی ناوداران" کە یەکەم چاپی لە هاوینی ساڵی 2005 بوو، وای کرد جارێکی تر گرینگی بەو بەرهەمە بدەینەوە و پێداچوونەوەیەکی وردتر بە رێنووس و زمانەوانییەکەیدا بکرێتەوە و دیسان بخرێتەوە بەرچاوی خوێنەر.

گرینگیی ئەو بەرهەمە لەوەدایە، رێگەی خوێنەری بۆ وەرگرتنی مەبەستی سەرەکی لە خوێندنەوەی کتێب کورت کردووەتەوە، بۆ نموونە، نووسەرێکی ناودار کە لە چەند توێ کتێب و هەزاران وشەدا مەبەستێکی لە شانە تا لە مێشکی خوێنەردا بارگەی بخا، لێرەدا لە یەك رستەدا بۆی پوخت و کورت کراوەتەوە.

خوێنەری کورد رۆژانە چەندان دەقی دوور و درێژی بەرچاو دەکەوێ کە زۆربەیان بەسوودن، بەڵام بەهۆی کەمیی کات و زۆرجار لاوازبوونی حەزی خوێندنەوە، وا دەکا خوێنەر زیاتر بەدوای کوورتەیەکی پوخت لە مەبەستی سەرەکیی نووسینەکەدا بگەڕێ، بۆیە ئێستە مانشێتی هەواڵەکان لە رۆژنامە، گۆوار و تەلەفزیۆنەکانەوە لای هەموو خوێنەرێك گرینگی پێ دەدرێ، چونکە کورتە و ئەگەر بە پرۆفیشناڵی نووسرابێ زیاتر لە 70٪ی ناوەڕۆکی رووداوەکەی لەخۆ گرتووە.

......................وتەی ناوداران ......................................................

ئەم کتێبەش، مانشێتی نووسراوەی زۆربەی ئەو نووسەرانەیە کە لە دنیای نووسین و خوێندنەوەدا بە بنەوای پەروەردەی هزری و کۆمەڵایەتیی گشتگیری هەموو جیهان دێنە ناسین.

*بەو هیوایەی سوودبەخش بێ*

هاوار بازیـان

کانوونی دووەم/یەنایەری 2012

1. بۆ مرۆڤی بێ هیوا، زەوی بەقەرا خۆی تەسکە.

"تۆلستۆی"

2. ئەگەر مزگێنییەکت بۆ کەسێك پێیە، پەلە بکە لە گەیاندنی.

"مۆرباك"

3. باشترین بەرنامەداڕشتن بۆ داهاتوو، سوود وەرگرتنی دروستە لە کات.

"ئالبر کامۆ"

4. مرۆڤی تێر و تەواو، کەسێکە ژیانی خۆی بە دەستی خۆی دروست بکات.

"ئارتۆر شۆپنهاوەر"

5. ئازادیی بیرکردنەوە، پێنووس و زمان و... دەبێتە هۆی ئاوەدانیی وڵات.

"عەلی ئەکبەر دێهخودا"

6. وتووێژی خۆت هاوڕێیانە دەست پێ بکە.

"ئیمام عەلی د.خ"

7. جوانترین شیعر لە سەرانسەری جیهاندا، لایەلایەی دایکانە..

"لامارتین"

8. ئیمان، دان بەخۆداگرتن و لێبووردنە.

"محەمەد د.خ"

9. کەسێك کە بەختەوەر نەبێ، تاوانبارە.

"ئەپیکتاتۆس"

10. ئەو مرۆڤە زاناترە، کە دەزانێ ئەقڵی کەمترە.

"سوقرات"

11. بە خۆڕاگری، دەتوانی بەهەموو شتێك بگەیت.

"ژان دۆلافۆنتن"

12. مرۆڤ خۆی داهێنەری چارەنووسی خۆیەتی.

"زەردەشت"

13. ئەگەر نەتوانین بە ئازادی بژین، باشتر وایە بە باوەشێکی کراوە پێشوازی لە مەرگ بکەین.

**"مهاتما گاندی"**

14. ئازادی، مافە و دەبێ وەربگیرێ و دیاریی نییە تا پێشکێش بکرێ.

**"رەحمەت نژاد"**

15. ئیرادە باشترین رێنوێنیی سرووشتە.

**"ساموئیل ئیسمایلز"**

16. بەبوونی ئیرادەی بەهێز، دەبیتە خاوەنی هەموو شتێك.

**"گۆتە"**

17. قەبارەی دنیای هەرکەس، بە رادەی گەورەییی بیرکردنەوەی خۆیەتی.

**"محەمەد حیجازی"**

18. بێ هیوایی واتە خۆش نەویستنی خۆت و بەس.

**"سیسرون"**

19. دوژمنەکانت خۆش بوێ.

**"عیسا د.خ"**

20. بەفیڕۆدانی کات، خۆکوشتنی راستەقینەیە.

**"یوونگ"**

21. بیر لە ژیان بکەنەوە، بەڵام خەمی بۆ مەخۆن.

**"دیل کارنگی"**

22. هاوڕێکانم دارایی و سامانی منن.

**"شکسپیر"**

23. پێکەنین، باشترین چەکی شەڕە لە دژی ژیان.

**"ئاناتۆل فرانس"**

24. پیاوی زانا کەسێکە هەمیشە حەزی لە فێربوونە.

**"ژان ژاك روسۆ"**

25. ئاسمانی بێ هەور وەك دەریای بێ ئاو و دارستانی بێ دارە.

**"لابرۆیر"**

26. داهاتوو هەمان هیوایە.

"ئیسپنۆزا"

27. خاوەنانی رەوشت و کردەی پاك، رۆحی کۆمەڵگەی خۆیانن.

"ئەمرسۆن"

28. ئەڤین و خۆشەویستی، بەهێزترین دەرمانن.

"نائۆمی جود"

29. ویستن، هەمان توانینە.

"ئێرانی".

30. راستگۆیی باشترین سیاسەتە.

"؟"

31. بەردەوام لە دوای فێربوون بە.

"جاکسۆن براون"

32. ئەقڵ شتێکە و قوتابخانە شتێکی تر کە زۆر جیاوازن.

"ئێرانی"

33. پشیلە ئەگەر کوێریش بێ، هەر بەدوای مشکدا دەکەوێ.

"عەرەبی"

34. بەردی گەورە بە مانای نەهاویژتنە.

"ئێرانی"

35. ئەو کەسەی قاچی هەیە و لەسەر پێ سواڵ دەکا، پێیەکانی لێ زیادە.

"عەرەبی"

36. بۆ ئەوەی بتوانین، دەبێ بزانین و بۆ ئەوەی بزانین دەبێ بخوێنین، کە واتە با بخوێنین تا بتوانین.

"؟"

37. بۆ مرۆڤی ئازا، خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان دەستی راست و چەپی لەشن کە سوود لە هەردووکیان وەردەگرێ.

"؟"

38. هەرچی زیاتر بیر لە رابردوو بکەینەوە، داهاتوویەکی باشترمان دەبێ.

"؟"

39. کەس لە بێدەنگی پەشیمان نەبووەتەوە، بەڵام زۆرن ئەوانەی لە زۆر بڵەیی تووشی پەشیمانی هاتوون.

"؟"

40. بەدەستهێنانی هەرجۆرە پلەیەکی بەرز، بەبێ یەك لەم 3 شتانە نایەتەدی، هەوڵدانی زۆر و بێ وچان، لەناوچوونی ماڵ و ژیان و ئاوارەبوون و دوورەوڵاتی.

"؟"

41. بۆ گرتنەبەری رێگەی هەزار کیلۆمەتریش، هەر پێویستیت بەهەنگاوی یەکەمە.

"؟"

42. ئەوەی ئازار نەبینێ، ئەستەمە ئارەزووەکانی ببینێ.

"؟"

43. کاتێك لەدایك دەبی، هەموو پێدەکەنن و تەنیا تۆی کە دەگری، ئاگەداربە لە دنیادا جۆرێك بژی کە کاتێك رۆیشتی، هەموو بگرین و تەنیا تۆبی کە پێدەکەنی.

"؟"

44. مرۆڤی زانا و ژیر بەدوای شتێکدا ناگەڕێ کە دەست ناکەوێ.

"؟"

45. تەمبەڵی، کلیلی دەرگەی سواڵکەرییە.

"؟"

46. بە نەرمی و لەسەرخۆیی، سەرکەوتن خێراتر و بەهێزترە.

"؟"

47. زمانی سوور، سەری سەوز بە با دەدات.

"؟"

48. سەرکەوتن، ئاوێکە لە جامێکی کونەوە دەڕژێ، دەبێ بە هەوڵ و کۆشش رایبگرین.

"؟"

49. سکی برسی ئیمانی نییە.

"؟"

50. ئەوەی پێبکەنێ، دنیا پێی پێدەکەنێ و ئەوەی بگری، ئەوە تەنیا هەر خۆیەتی کە دەگری.

"؟"

51. هەر ئەوەی بەناوی ئامانجێك ئیرادە بكەین، هەنگاوێكی گەورەمان بۆ بەدەستهێنانی هاویشتووە.

**"سی فۆستەر"**

52. شاد بن بە سەركەوتنی خەڵكانی تر، چونكە سەركەوتن بەشی هەموو كەس هەیە.

**"لوئیس هێمی"**

53. گەورەترین جیاوازیی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ تەنیا تێگەیشتن و ئەقڵ نییە ، بگرە خواست و بڕیارە.

**"ژان ژاك رۆسۆ"**

54. هیچ شتێك باش یان خراپ نییە، تەنیا هێزی بیركردنەوەمانە جۆری باشی یان خراپی دروست دەكات.

**"شكسپیر"**

55. تاكە رێگەی پەیداكردنی هاوڕێ ئەوەیە، سەرەتا خۆمان دۆستایەتی دەربڕین.

**"ئامرسۆن"**

56. نهێنیی سەرکەوتن لە خۆڕاگریدایە.

**"دیزرادئیل"**

57. پشوودرێژی و ئومێد، 2 هۆی سەرەکین لە سەرکەوتن.

**"ئەسکەندەر دۆما"**

58. ئەو سەرکەوتنانەی مرۆڤ بەدەستی هێناون، بەگشتی بەرهەمی پشوودرێژی و دان بەخۆداگرتن بوونە.

**"شکسپیر"**

59. ئەگەر لە یەکەم هەنگاودا بێ دژواری سەرکەوتوو بین، ئیتر هەوڵ و کۆشش هیچ واتایەکی نابێ.

**"مەترلینگ"**

60. لێبووردەیی، کلیلی شادی و بەختەوەرییە.

**"جیمبالسکی"**

61. بگەڕێن تا بدۆزنەوە، ئەوە شتانەی بەدوایاندا ناگەڕێین، هەروا بە نەدۆزراوەیی دەمێننەوە.

**"سوفکل"**

62. بێ ئۆقرەیی، کۆسپێکی گەورەی بەردەم ڕێگەی سەرکەوتنە.

**"ناپلیۆن"**

63. من هەموو سەرکەوتنەکانم قەرزداری ئەو ئومێدانەم کە لە قۆناغی لاویێتیدا لە دڵمدا چاندبوومن.

**"ناپیلۆن"**

64. بەختەوەری لەوەدایە مرۆڤ بزانێ چی دەوێ و بەدڵ و بەگیان چاوی لە ئارەزووەکانی بێ.

**"هاربر"**

65. ڕاشکاوی و ڕژدبوون لە کاردا، باشتر لە ئامانجەکان نێزیکمان دەکاتەوە.

**"شیلر"**

66. ڕەمز و کلیلی سەرکەوتنەکان، تەنیا ویست و ئیرادەیە.

**"ڕۆبرستۆن"**

67. هیچ ڕۆژێکمان لە ئەمڕۆ بەنرختر و مەزنتر نییە.

**"گوتە"**

68. خۆشەویستی مێوەی هەموو وەرزێکە و لە بەردەستی هەموواندایە.

"دایکە ترێزا"

69. لە رەوتی پێچەوانە مەترسە، باڵۆن تا رووبەڕووی باهۆزی پێچەوانە نەبێتەوە، بەرەو بەرزی ناڕوات.

"چرچیل"

70. ئەگەر دەتەوێ خۆشیان بوێی، خۆشت بوێن و خۆشەویست بە.

"فرانکلین"

71. بە پێیەکانی خۆم هێندە دەڕۆم تا ئەژنۆکانم شل دەبن.

"ژاندارک"

72. ئەگەر بەردەوام خەریکی بیستنی رەخنە و قسەی بێ سوودی خەڵك بم، کاتێك بۆ کارەکانی خۆم نامێنێ.

"لینکۆڵن"

73. زانست و ناسین ، 2 یاری بەوەفای ژیانن کە هەرگیز ناڕاستییان لێ نابینی.

"جبران خلیل جبران"

74. زەردەخەنە جوانترین ئارایشی رووخسارە.

"جبران خليل جبران"

75. چاودێریی دوژمن بکە، تەنانەت ئەگەر ئەو دوژمنە مشکیش بێت.

"؟"

76. زۆرداری ئەگەریش سەر بکەوێ ، تەمەنی کورتە.

"ئەبراهام لینکۆڵن"

77. هەستی نیشتمانپەروەری و ئازادیخوازی لەدڵی هەموو کوردێکدا جێگیر بووە و دەستی لێ هەڵناگیرێ.

"پێشەوا قازی"

78. ئاکە گەنجینەیەک کە نرخی بەدوا گەڕانیدا هەبێ، ئەوە ئامانجە.

"دویی ستۆنی"

79. بۆ هەر کارێک یەک مەرجی بنەڕەتی هەیە، بوونی ئیرادەی بەهێز، ئەگینا پێویست بەهیچ مەرجێکی تر ناکا.

"لینکۆڵن"

80. گرفتەکان وەك موعجیزە بچووکەکان سەیر بکە، لەگەڵ خۆیاندا زانست و گۆڕانکاری بەدیاری دێنن.

**"لیو بوسکالیا"**

81. ژیان بەپێی ترسنۆکی و ئازایەتیی مرۆڤ، تەنگەبەر و بەرفرەوان دێتە بەرچاو.

**"ئاینس نین"**

82. پێنووس کاریگەرترین چەکە.

**"بیتهوڤن"**

83. دنیا ئەوەندە پڕ لە فرەوانییە کە چارەیەکتان نییە جگە لە شادیکردن.

**"رابرت لویس"**

84. لە تاریکیدایە کە چاو دەست بەبینین دەکا و نرخی چاو دەردەکەوێ.

**"تیودور رودکی"**

85. لە هەموو رۆژێکدا بەدوای ئیرادەی خواوە بن.

**"کارل گوستاف"**

86. ژیانی راستەقینە کاتێکە کە گۆڕانکارییەکی بچووك روو دەدات.

"تولستۆی"

87. بەرەو مانگ هەڵکشێ ، ئەگەر رێگەکەشت هەڵە بێ ئەوە دەبیتە هاونشینی ئەستێرە بەرزەکان.

"براون"

88. ئەوەی کەسانی تر دەناسێ زانا و ژیرە، بەڵام ئەوەی خۆی دەناسێ بە دڵ و ئەقڵ وریایە.

"لائۆتسە"

89. مرۆڤ تا ئەو کاتەی لە جیهانی شتە ناسراوەکانەوە بەرەو جیهانی شتە نەناسراوەکان هەنگاو نەنێ و خۆی بەرپرس نەزانێ، فێری هیچ شتێك نابێ.

"کلود برنارد"

90. بیر و خەیاڵ ئەو توانایە بە مرۆڤ دەبەخشێ تا خۆی لە شوێن و کاتی ئێستەی بخاتە دەرەوە و هەموو سنوورێك بشکێنێ و بەخواستی خۆی هەموو شتێك ببینێ.

"چارلز فیلمور"

91. سکاڵاکردن نەریتێکە و دەبێ شتێك بکرێتە شوێنگرەوەی.

"سۆزان جۆش"

92. تەنیا یەك دەسەڵات هەیە کە بەردەوامە و نایەتە وەستان، ئەویش دەسەڵاتی خوایە.

"فلورانس شین"

93. سوپاس و ستایشکردن دەرگەکان دەکەنەوە، چونکە ئومێد و چاوەڕوانی بەردەوام سەرکەوتوون.

"فلورانس شین"

94. تەنیا مرۆڤی گەشبینە کە توانای خۆسازدانی بۆ داهاتوو هەیە.

"ماریانا ئاشترڤیر"

95. داهێنان تەنیا بەرجەستەبوونی شتێکە کە لە پێشتردا هەبووە.

"شریمات"

96. نەبوونی بوێری بۆ سەختبوونی کاروبارەکان ناگەڕێتەوە، ئێمەین بوێریمان نییە و کارەکان سەخت دەبینین.

"سنکا"

97. ئاواتەخوازی ئەوە مەبە ببیتە شتێکی جیا لەوەی ئێستەی هەی، بگرە هەوڵ بدە لە لووتکەی ئێستەتدابی.

"سیلز"

98. فێربن لەگەڵ بێدەنگیی دەرووندا پێوەندیتان هەبێ تا لەهەموو مەبەستەکانی دەوروبەرتان بگەن.

"ئیلیزابێت کویلر"

99. کاڵە مەکە، هەڵمەچوو و هەوڵ بدە لە شتەکان بگەی.

"باروّله ئەسپینۆزا"

100. لە ترۆپکی پێکەنین دایە کە بوونەوەران بە پانتاییەکی بەرفرەوان دەگۆڕێن.

"جین هۆستن"

101. بچیتە هەرکوێ و هەرکەس ببینی، هەمان ئەو خۆشەویستییە بەدی دەکەیت کە چاوەڕێتە.

" لویس هێی"

102. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی خۆ خۆشویستن ئەوەیە هەستی چاك بوون لە دەروونتدا سەر هەڵدەدا.

"دیل کارنگی"

103. نیشانە و هێمای مرۆڤی راستەقینە ئەوەیە ئامادەی خۆبەخشین بێ.

"وێلس وانی"

104. ئامانجەکانت دەبێ لەسەر راستی بنیات بنێی.

"ئامرسۆن"

105. بەختەوەری تەنیا ئەوەیە کە بتوانی ژیانت بە حەز و دڵخوازیی خوت بەریتە سەر.

"مۆرلی"

106. ئەوانەی خۆر دەبەخشنە ژیانی کەسانی تر، ناتوانن خۆیان لە تیشکی هەتاوەکە بێبەش بن.

"جیمس باری"

107. پڕ بەهاترین و جوانترینەکانی جیهان، نابنیرێن، بەردەست نین و نایەتە دەستنیشانکردن، بگرە تەنیا دەبێ لەدڵدا هەستیان پێ بکەی.

"هلن کلێر"

108. مرۆڤی خەیاڵاوی هەمیشە بە ئومێدی ژیانی رۆژی دواتری دەژی.

"دیل کارنگی"

109. گەورەیی و بلیمەتیی مرۆڤ، لە گەورەیی و بلیمەتیی خەیاڵ و تێڕوانینەکانیدایە.

"سیناى فاین"

110. ئەگەر چاو لە هەتاو ببڕی ، ناتوانی سێبەر ببینی و تەنیا رۆژ و رووناکییە لەبەرچاوتە.

"هلن کیر"

111. پێم دەڵێن ئەگەر مرۆڤێکی دیلت بینی خەوتووە، لە خەوی مەکە بەڵکوو خەون بە ئازادییەوە ببینێ، بەڵام من دەڵێم ئەگەر مرۆڤێکی دیلم بینی خەوتووە، بە ئاگەی دێنم و باسی ئازادی بۆ دەکەم.

"ئابراهام لینکۆڵن"

112. بڕوا بکە بەوەی کە خۆت مرۆڤێکی خاوەن بڕوای.

"؟"

113. ئەگەر بە ئیفلیجی لە دایك بووی و نەبوویت بە قارەمانی جیهان، دیسان هەر هەڵە و سووچی خۆتە.

"؟"

114. تا زیندووم ساتێك ئارام نابم، پشووەرگرتن و مردن لای هیچ جیاوازیان نییە.

"ناپلیۆن"

115. ژیان بەبێ کارکردن، مردنی پێش وەختەیە.

"گۆتە"

116. هەموو نووسینێك سوودبەخشە، جگە لەو نووسینەی تایبەت بە بێزارکردن دەنووسرێ.

"ڤۆلتێر"

117. دەبێ بژیت بۆ نووسین نەك بنووسی بۆ ژیان.

"ژول رێنارت"

118. دەبێ لە راوێژکاریدا بۆ کارێك، وردبین و ئارام بیت و لە راپەڕاندنیدا راشکاو و ڕووڕاست.

"ناپلیۆن"

119. لـــە جیـــاتی ڕەخنـــەگرتن و ســـەرکۆنەکردن، چارەســـەرێك بدۆزەوە.

"هنری فۆرد"

120. خراپترین خەمەکان، گومان و دوو دڵییە.

"ئەلکساندر دۆما"

121. زەوی، کارنامـــەی خـــەیاڵ و گەنجینـــەی ئـــەقڵ و دەفتـــەری تۆمارکردنی ویژدان و کۆگای هزر و بیرە.

"بازیل"

122. زەوی، ئەو گەنجینەیە کە دەبێ سەرمایەی لەسەر دابنێین و ئەو یارمەتییەی پێویستیمانە لێی وەربگرین.

"روو"

123. ئاگردانەکـە بـۆ دوژمـن هێنـدە گـەرم مەکـە، کـە تـۆش هـەم بسووتێنیێ.

"شکسپیر"

124. لێبووردن لە هەڵەکان، تۆڵەسەندنەوەیەکی نەرمە.

"دیل کارنگی"

125. هەرکەس لێبووردەیی زیاترە، دەوڵەمەندترە.

"ژۆرژ سیون"

126. لەناو دڵی خۆتدا بنووسە، هەموو رۆژێك باشترین و خۆشترین رۆژی ساڵە.

"ئامرسۆن"

127. بوێر و نەترس ئەو کەسەیە ترس بناسێ، بەڵام خۆی بەسەردا زاڵ بکا.

"نیچە"

128. لە هەر شوێنێك بیت و بەهەرچی لەبەر دەستتدا هەیە، کار بکە.

"رۆزڤێلت"

129. ئارامیی دەروون و راستەقینە لەوەدایە کە موزیکژەن ئاهەنگی جوان ساز بکا، نیگارکێش وێنای سروشت بکێشێ و شاعیر شیعری جوانپەرستی بهۆنێتەوە.

"ئەبراهام مەزلو"

130. خەم مەرگی رۆحە و شادی ژیانێتی.

"ڤینە"

131. ڕۆژگار زۆر میهرەبانە بۆ کەسێك کە بزانێ کاتی خۆی چۆن و بەچی تێپەڕ دەکات.

**"لۆرد ئەڤیبوری"**

132. گەورەترین هونەری ژیان، سوود وەرگرتنە لە دەرفەتە لەبارەکانی ژیان کە بەسەرماندا تێپەڕ دەبن.

**"سالوئیل"**

133. ژیان، بەدیهێنانی بەرهەمی نەمرە.

**"ڤینە"**

134. لە دڵەوە بڵێ و هەموو شتێك لە گۆشەنیگای بەرامبەرەکەتەوە بڕوانە.

**"دیل کارنگی"**

135. کەم زانین و زۆرگوتن وەك نەبوونی و زۆر خەرج کردنە.

**"ناپلیۆن"**

136. بەختەوەریی خێزانی، درێژخایەنترین، پتەوترین و شیرینترین بەختەوەرییە.

**"گولتێر"**

137. بیر و را گۆڕینەوە، هەمیشە لە کێشانی شمشێر و شەڕکردن باشترە.

"ناپلیۆن"

138. دەمەوێ دەستەویەخەی چارەنووس بم و هاوار بکەم کە ئەو ناتوانێ سەری من بەرامبەر ژیاندا بچەمێنێ.

"بتهوڤن"

139. تەنیا بێدەنگییە کە من بە زانین دەگەیەنێ.

"راما کریشیا"

140. لەگەڵ خەڵکی تردا پێ بکەنە، نەك ئەوەی پێیان پێ بکەنی.

"دیل کارنگی"

141. زەردەخەنە، دوژمن دەکات بە دۆست.

"جۆرج نیکۆلا"

142. درەوشاوەترین تاج کە خەڵك دەیخەنە سەریان لە ناو ئاگری کوورەکاندا دروست کراوە.

"چارلی چاپلین"

143. هەڵەکردن کارێکی ئاساییە، بەڵام دووبارە کردنەوەی هەمان هەڵە نەزانییەوە.

**"ئەناتول فرانس"**

144. گۆڕینی فرمێسکی خەڵك بۆ شادی ، باشترین بەختەوەرییە.

**"بـــودا"**

145. بەختەوەری وەك تۆپی یاریی تۆپی پێ وایە، کاتێك لێمان دوورە بە دوایدا وێڵین، کاتێکیش پێی دەگەین شەقێکی تێ هەڵدەدەین، دواتر گلەیی دەکەین لەوەی بۆچی ناگەینە بەختەوەری.

**"شاتوبریان"**

146. ناوی بەخت و چانس لەو شتانە دەنێین سنوورمان بۆ دیاری دەکەن و ڕێگە نادەن بەدڵی خۆمان بژین.

**"ئامرسۆن"**

147. بەختەوەرترین مرۆڤ، ئەو کەسەیە نیازی بەختەوەرکردنی کەسێکی تری لە دڵدایە.

**"لادۆ شفۆکۆ"**

148. هەڵکردن لەگەڵ مرۆڤی بێ ئەمەکدا، زۆر دژوارترە لەوەی هەوراز و نشێوەکانی رۆژگار تێپەڕ بکەی.

**"ناپلیۆن"**

149. زەردەخەنە تەنیا ساتێك بەردەوامە، بەڵام یادەکەی بە درێژایی هەموو تەمەن دەمێنیتەوە.

**"؟"**

150. پێشتر خۆت بۆ گورزی رۆژگار ئامادە بکە، تا بە سووکی هەست بە ئازارەکانی ئەو لێدانە بکەی.

**"دیوژن"**

151. دەگمەنن ئەو شتانەی کە نرخیان لە بەهای بێدەنگی زیاترە.

**"هێنری دۆمۆنتێر"**

152. ئەو پیاوانەی هەمیشە دوودڵ و ڕاڕایین و ناتوانن بڕیار بدەن، هەرگیز بەختەوەر نابن.

**"ناپلیۆن"**

153. هەرگیز بیر لە رابردووی خۆم ناکەمەوە، مەگەر بمەوێ ئەنجامێکی لێ وەرگرم.

**"ئەهرۆ"**

154. ئەوانەی هەست بە راستی دەکەن و ئەوانەی راستییان خۆش دەوێ، زۆر لێك جیاوازن.

**"کونفۆسیۆس"**

155. توورەبوون، تۆڵەکردنەوەی هەڵەکانی خەڵکی ترە لە خۆت.

**"ڤولیتر پۆپ"**

156. کارەسات لە کەوتندا نییە، بەڵکوو کارەسات ئەوەیە توانای دووبارە هەستانەوەت نەبێ.

**"لیمباردی"**

157. زۆر خەمم دەخوارد لەوەی بۆچی پێڵاوم نییە، تا ئەوکاتەی کەسێکم بینی کە هەر قاچ و پێی نەبوو.

**"دیل کارنگی"**

158. مانگ هەمیشە ئارەزووی گەرمیی رۆژی هەیە و خۆریش بەدوای تاریکیی مانگەشەودا وێڵە.

"هافمن"

159. ئەگەر بێدەنگ بی و خەڵکی تر وەقسەت بێنن باشترە لەوەی لە کاتی قسەکردندا بێدەنگت بکەن.

"سوقرات"

160. ئەگەر نیازی زاڵبوونت بەسەر دنیادا هەیە، سەرەتا ئەقڵ و زانایی بەسەر خۆتدا زاڵ بکە.

"تولستۆی"

161. مرۆڤی لێزان لەچاوەڕوانیی دەرفەتێکی لەباری ژیاندا ناوەستێ، بگرە خۆی دەرفەت دەخولقێنێ.

"فرانسس بیکەن"

162. ژیان بێ گاڵتەکردن واتەی نییە، دەبێ بتوانی بەخۆت پێ بکەنی، ئەگینا تووشی رەنج و ئەستەمی دەبی.

"دراتمن"

163. بەختەوەری لەوەدایە بتوانی بە دڵ و حەزی خۆت ژیان بەریتەسەر.

**"کریستۆفەر مورلی"**

164. تێکۆشان هەرچەندەش سەخت بوو، تۆ بەردەوام بە، دوور نییە تەنیا هەنگاوێك لە قەڵای سەرکەوتن دوور بی.

**"دیناویست لیك"**

165. هەمیشە ئەو خۆشییانەی بژمێرن کە دەستتان کەوتووە، نەك ئەوانەی هێشتا لێیان دوورن.

**"دیل کارنگی"**

166. ئەگەر لیمۆیەکی ترشت لە دەستدایە، خواردنەوەیەکی شیرینی لێ دروست بکە.

**"دیل کارنگی"**

167. تێکەڵ بە کەسانێك مەبە کە ناتوانن نهێنییەکانی خۆیان بپارێزن.

**"ئەفلاتون"**

168. زیندووبوون لە ناو دڵەکاندا، بە مانای نەمری و هەمیشە زیندوویییە.

"تامس کیمپل"

169. ئەنجامدانی کاری نامومکین و زۆر ئەستەم، جۆرێکە لە چێژ وەرگرتن.

"ڤالت دیزنی"

170. شکستهێنان شتێك نییە جگە لەوەی بەبیانووی شکست دەست لە هەوڵدان هەڵدەگری.

"ئالبێرت"

171. هیچ چاکە و خراپەیەك بوونی نییە، جگە لەو شتانەی بەرهەمی خەیاڵن و بەچاك یان خراپ دادەنرێن.

"شکسپیر"

172. مەبەستی کۆتایی لە پەروەردەکردن، زانابوونی تاك نییە، بگرە ئەوەیە تاك بەکردەوە بوونی هەبێ.

"ئاسپێنسر"

173. شانس هاوڕێی ئەوانەیە کە وازیان لە شانس هێناوە و بڕوایان تەنیا بە خۆیان و کاریان هەیە.

"دیلا مارتین"

174. بەختەوەری لەناو ماڵی خۆتاندایە، بێ سوود لەناو باخی بێگانەدا بەدوایدا مەگەڕێن.

"مارك ئوراڵ"

175. ئازادی، شتێك نییە جگە لە دەرفەتێك بۆ باشتربوونی خۆت.

"کامۆ"

176. هەرگیز لەناو گوێچکەی مرۆڤی کەڕدا چرپە مەکە و چاو لە مرۆڤی کوێر هەڵمەتەکێنە.

"پرۆڤلوب"

177. پێ مەخە شوێن هەنگاوەکان، بەڵکوو خۆت شوێنپێی نوێ دروست بکە.

"ماتسیو باشۆ"

178. هیچ شتێك پڕبەهاتر لە ئەمڕۆکەت نییە کە تێیدا زیندووی.

"یوهان"

179.لە ژیاندا نابێ لە هیچ بترسی، بەڵکوو دەبێ لێی تێبگەی.

**"ماری کوری"**

180. مرۆڤ ئەو کەسەیە خۆی بڕوا بە خۆی دەکات.

**"چیخۆف"**

181. بۆ بەدەستهێنانی ئازادی، دەبێ مرۆڤ خۆی کۆنترۆڵ بکات.

**"ڤۆلف"**

182. هەرچی بەمێشك بسپێری، متمانەی پێ دەکا، هەرچی لەبارەی خۆتەوە داوای بکەی بۆت دەخولقێنێ.

**"شاهلمستر"**

183. بۆ کەسی خاوەن بڕوا، هیچ شتێك نامومکین نییە.

**"ئینجیل"**

184. مرۆڤ بە هۆی دڵیەوە دەناسرێ، نەك لە ڕێگەی چاو و هۆشی.

**"مارتۆڤان"**

185. ئەو کەسەی دەکەوێتە مەیدانی رکابەرییەوە، جەستەی ناخاتە داوی ماندووبوونەوە.

**"ناتان بێلی"**

186. بۆ ئەوەی لەڕووی ویژدانەوە بیر بکەینەوە دەبێ لە مەبەستی خەڵکانی تر تێبگەین.

**"ولیام هازلیت"**

187. تا ئەو کاتەی وازت لە پرسیارکردن نەهێناوە، دیارە هێشتا خۆت رادەستی نەزانیی نەکردووە.

**"چارلز ستینهاتس"**

188. هەرچەندە ناتوانین دەستبەجێ هەموو کارەکان تەواو بکەین، لانیکەم دەتوانین دەستبەجێ کارێك بکەین.

**"کولریج"**

189. هاوڕێتی لەسەر بنەمای کارکردن پتەوترە لە کارکردن لەسەر بنەمای هاوڕێتی.

**"جان رۆکلێتەر"**

190. ئەگەر هەندێك دان بەخۆدا بگرین، دەبینە خاوەن جوجكە بێ ئەوەی ناچار بین هێلكەكە بشكێنین.

"لینكۆڵن"

191. یەكەم هەنگاوی چارەسەركردنی گرفت ئەوەیە كە مرۆڤ سەرەتا دان بەهەبوونی گرفتەكەدا بنێ.

"مێری ئاش"

192. ئەگەر گرفت بە چاكی روون بێتەوە، ئەوە نیوەی رێگەی چارەسەركردنی گرفتەكەمان بڕیوە.

"چارلز كترنینگ"

193. دەستكەوتی خێرایی، دەنگ و هەرای زۆری بەدوادا دێ.

"جان ئەنۆیە"

194. بەدوای هەر شتێكدابی، هەر ئەوەندەی دەبینی كە سەرەتا مەبەستت بووە.

"ڤـــاربـــاس"

195. هەموو کەس هەڵە دەکا، بەڵام پێداگریکردن لەسەر دووبارەکردنەوەی هەڵەکە، ئەوپەڕی نەزانییە.

"کیلکۆرۆ"

196. ئەو کەسەی لە کاتی گفتوگۆکردندا یەکەمجار دەنگی بەرز دەکاتەوە، ئەوە شکست دێنێ.

"؟"

197. هیچ دەرگەیەك دامەخە، رەنگە لەکاتی ناچاریدا تاکە رێگەی دەربازبوونت هەمان ئەو دەرگەیە بێ.

"دۆن هارۆڵد"

198. بەهۆی بوێری و چەکداربوونێکی کاراوە، دەتوانین بەسەر هەموو کۆسپێکدا زاڵ بین.

"هێنری کلای"

199. کۆسپەکان هەمان گرفتە ترسێنەرەکانن کە لە کاتی فەرامۆشکردنی ئامانجدا تووشی مرۆڤ دەبن.

"هەنان مارا"

200. مانای راستەقینەی شکست: هەوڵەکانت هەموو خەسار بکەی تەنیا لەوەی هەمووکەس رازی بکەی.

**"هاربرت سوپ"**

201. ئەگەر من هاوشێوەی ئەو بم، کێ هاوشێوەی من دەبێ؟

**"ئەتۆنی مۆس"**

202. بە هەڵکشان لە پەیژەی پێچاوپێچە کە مرۆڤ دەگاتە لووتکەی شتەکان.

**"باکون"**

203. بەدەستهێنانی ئەزموون، قەدبڕکردنی کاتە و هەر کەس پڕچەك بێ بە ئەزموون، پێویستە ئەزموونەکانی بخاتە خزمەت دابینکردنی هەرچی باشتری ژیان.

**"کلوفورد سلۆن"**

204. گەورەترین نیشانەی شکستهێنانی مرۆڤ، نەمانی پشتیوان و پاڵپشتە، نەك لەدەستدانی لێهاتوویی.

**"ویلیام کۆبت"**

205. هەموو کارێکی گەورە لە سەرەتادا هەندێك ئەستەمی و دژواری پێوە دیارە.

"کارلیال"

206. ئەو قەیرانەی ئەمڕۆ تووشت هاتووە، سبەی خۆت گاڵتەی پێ دەکەی.

"ویلس"

207. تا ئەو کاتەی گەشبین نەبی، سوود لە جموجۆڵەکانت نابینی.

"جان بۆجن"

208. لە رێگەی بەختەوەریدا، خۆڕاگری و بەرگری کاریگەرترە لە هۆشمەندبوون و زیرەکیی.

"لۆیت جۆنی"

209. بەختەوەر نەبوونی مرۆڤ بۆ نەبوونی بوێری و ئازایەتی لە یەکەم هەنگاوەکانی کارەکانیدا دەگەڕێتەوە.

"نۆرتیکا"

210. گەورەترین هەڵە لە ژیاندا ئەوەیە کە مرۆڤ بەردەوام لە هەڵەکردن بترسێ.

"هوبارت"

211. هیچ کەس بێ ئازایەتی و بینینی ناخۆشی ناگاتە پلەی بەرز.

"سیریوس"

212. بەختەوەری، پاداشتی هەموو ئەو کەسانەیە کە بەرەو پیلی گیر و گرفتەکان دەچن و پێشوازی لێدەکەن.

"ڤولتێر"

213. ئەو رۆژە تۆ بەرز و شکۆداری کە بتوانی لە ناخی دڵتەوە بە خۆت پێ بکەنی.

"برێموری"

214. بۆ زاڵبوون بەسەر داهاتوودا، پێویستە مرۆڤ لە زمانی سەردەم بزانێ.

"جان نێسیت"

215. سوودوەرگرتن لە ئامۆژگاریی باش، وادەکات داوای سوودی زیاتری لێ بکەی.

"جان کۆلنز"

216. بەختەوەری، واتە سەرنج و گوێ نەدان بەقسەی پووچی خەڵکی تر و رکابەریکردن تەنیا لەگەڵ خۆتدا.

"نیۆتۆن"

217. بەبڕوای من، کلیلی بەختەوەری، راستگۆییە لە کارکردن و ئاخاڤتن و بیر کردنەوەدا.

"ئیتیر هارد"

218. مرۆڤی راستەقینە دەبێ ئەمڕۆی لە دوێنێ باشتر بێ.

"نیۆتۆن"

219. هونەری هێوری و لەسەرخۆ بوون لە نهێنییەکانی بەختەوەرین.

"مەك گۆریك"

220. یەکێك لە هۆکانی بەختەوەربوون، بوونی خواست و ئیرادەیەکی پۆڵایینە.

"لوئیس پاستۆر"

221. ئەگەر کەسێك نەبێتە قوربانیی نائومێدی، لە کۆتاییدا ناچارە هەر سەربکەوێ.

"ئابراهام لینکۆڵن"

222. نەهامەتی، ئەقڵ و زانایی ئاشکرا دەکا و تەوەزەلی، ژیری و هۆشیاری دەشارێتەوە.

"هوراچ"

223. خۆت لە ئامۆژگاریکردنی بێ سوود بپارێزە.

"جۆزف"

224. ئامۆژگاری وەك دەرمانی بازاڕ وایە، دەبێ پێشکێشی ئەو نەخۆشانە بکرێ کە راستەوخۆ داوای دەکەن.

"بیلینگز"

225. داربـــەڕوو لەلافاوی بەربڵاو نەترسیٚ، چونکە ئەو لافاوە ڕەگی دارەکەی باشتر دادەکوتیٚ.

**"جۆرج هاربێرت"**

226. هیچ دوژمنێك وەك ئامۆژگـاریی چـەوت و خـراپ نابێتـە مایـەی مەترسی.

**"فوکلوس"**

227. ئاگەداری هەموو پەندێك بە بزانە چۆن لەسـەر خـۆت بـەکاری دەبەی، بۆ نموونە ئەمەشیان!

**"ساینێرگ"**

228. ســەرکەوتنە بــچووکەکان، لـــە کۆتاییـــدا دەبنـــە هـــۆی بەختەوەرییەکی گەورە.

**"مێریکی"**

229. بەختەوەری لەوەدایە کە سنووری هەموو شتێك بزانین و ڕێزی لیٚ بگرین.

**"رۆلان"**

230. هەرکەس بەتوانا بێ، جێگەی شیاوی خۆی وەردەگرێ.

"چارلز"

231. گەورەترین توانایی، لە بڕوا بەخۆبوون دایە.

"باب جۆنز"

232. بەختەوەری یاخۆ چارەڕەشی، پێوەندییەکی نێزیکی بەشێوەی بیرکردنەوەی خۆتەوە هەیە.

"جەیمز ئالن"

233. بەختەوەری، واتە کۆششی بێ پسانەوە و دەستەبەرکردنی داخوازیی خەڵك.

"ئەلبارسۆن"

234. مرۆڤی سەرکەتوو وەك دریل و مەتە کار دەکا، هەموو هێزی خوی لەسەر یەك خاڵدا لە نووکیدا چڕ دەکاتەوە و بۆ کەمترین کار زۆرترین هێز بەکار دەبا.

"کریستیان بۆڤی"

235. هیچ شمشێرێك بوونی نییە کە نیازی هەبێ دژی خۆشەویستی و میهرەبانی شەڕ بکا.

"؟"

236. ژمارەی مێشهەنگ هەرچەندە زیاد بکا، هێشتا گوڵ زیاترە، دڵی خەمگین هەرچەندە زۆر هەبێ ئەوە دڵە شادەکان زیاترن، بۆیە ناکرێ لەگەڵ بینینی دڵێکی خەمگرتوودا بڵێین کە جیهان هەمووی هەر شوێنی خەمانە.

"شکسپیر"

237. دەرکردنی بڕیاری سزا لەکاتی هەڵچووندا، کارێکی باش و بەجێ نییە، بگرە هەمووی تۆڵە سەندنەوەیە.

"مۆنتینین"

238. ئەگەر تەندروستیت باش بێ، چێژی باشتر و خۆشتر لە خواردن وەردەگری.

"ئەرەستو"

239. ژیانی ئێمە، دەرەنجامی ئەندێشە و هزری تەنیا خۆمانە.

"ئۆرل"

240. مرۆڤ هەرچەندە تێگەیشتووتر بێ، کەمتر لە خۆبایی و خۆ بەزلزانە.

"؟"

241. توورەیی بە توورەیی چارەسەر ناکرێ، بەڵام بە خۆشەویستی و جوامێری دەکرێ بەسەریدا زاڵ بیت.

"دیکارت"

242. ڕێگە مەدە زمـان بەر لە بیرکردنەوە بجووڵێ.

"شیلون"

243. بۆ ئەوەی باش بژیت، دەبێ خۆت لەسەرووی ژیان دابنێی، واتە فێر بی هەمیشە بەرەو هەوراز هەڵکشێی و سەیری خوارەوە بکەی و هەست بکەی چەندە بەرەو لووتکە چوویە.

"نیچە"

244. سەرەتا چاك بین ئەوجا بەختەوەر دەبین، داوای پاداشتی بەر لە سەرکەوتن و کرێی بەر لە کارکردن مەکە.

"روسۆ"

245. هەرکەس توانی شیعر لەگەڵ راستی و حیکمەتدا ئاشت بکاتەوە، ئەو کەسە شاعیرێکی راستەقینەیە.

"بایرون"

246. خەڵکینە، بۆچی لەدەرەوەی خۆتاندا بەدوای بەختەوەریدا وێڵن؟ بەختەوەری لە دەروونی خۆتاندایە.

"بیونیۆس"

247. دان بەخۆداگرتن و لێبووردەیی، باشترین ئامرازن بۆ لادانی هەموو ناخۆشییەکان.

"پلۆتۆس"

248. تاکە رێگەی پەیداکردنی هاورێ ئەوەیە، سەرەتا لەگەڵ خۆماندا باسی هاورێیەتی بکەین.

"ئامرسۆن"

249. تووڕەیی و هەڵچوون، ناچێتە ژوور دەرگەی مرۆڤی پڕ لە ئیرادە و خواستەوە.

"سوقرات"

250. باشترین کات بۆ پەروەردەکردنی ئیرادە و خواستی دەروونـی، قۆناغی لاویێتییە.

"لای"

251. کرداری باش وەك ئاوی رەوان وایە، بەرهەمەکانی مرۆڤ بەپیت و تێر ئاو دەکا.

"لائوك"

252. پەلەکردن لە کـاردا، لەمپەرێکـە رێگـە لـە سـەرکەوتنی گـەورە دەگرێ.

"ناپلیۆن"

253. خۆشـییە بـچووکەکانت، بەختەوەرییـەکی گـەورەیان بـۆ هەلگرتووی.

"ئالفۆنس"

254. چـاکە بەسـەر هـەموو شـتێکدا زاڵـە و هـیچ شـتێك نـاتوانێ بەسەریدا زاڵ بێ.

"تولستۆی"

255. هەر هەنگاوێکی گەورە، لە سەرەتادا مەحاڵ و نەکردەیی دێتە بەرچاو.

"کارلایل"

256. مرۆڤ، جیهانێکە پڕ لە سەیر و سەمەرە.

"ئەرەستو"

257. هیچ شتێك وەك پشوودرێژی پڕ لە سەرکەوتن و دەستکەوت نییە.

"؟"

258. ئەو کەسەی لە خۆی دڵنیا بێ، پێویستی بە پێدا هەڵگوتنی کەس نییە.

"گۆستاڤ"

259. سەردەمێك لە رێگەدایە کە تێیدا بێدەنگی زیاتر لە هەموو ئاخاڤتنێك مەبەست دەگەیەنێ.

"مونتسکیو"

260. ئـەوە کـار و تێکۆشـانە دەبێتـە مایـەی هێـزی زیـاتر، نـەک پشوودان.

"ستاهل"

261. خۆشەویستی سەرچاوەی هەموو شتێك، ڕێنوێنیکار و کـۆتای هەموو شتێکە.

"لاکوردر"

262. باشترین تۆڵەسەندنەوە، لەبیرکردن و لێبووردنە.

"جۆنس"

263. مرۆڤە ناودارەکانی جیهان، هەمان بوێرترین کەسەکانن.

"سترن"

264. قسەی چاك بکە یان ئەوەی ژیرانە و زۆر بە زانایی بێدەنگ بە.

"هیربرت"

265. ئەسپی چاك بە گەستنێکی مێش لە ڕۆیشتن ناکەوێ.

"ڤۆلتیر"

266. بیرهێنانەوەی شتە چاکەکان، زۆر سوود بەخشە.

"شکسپیر"

267. خۆشەویستی، گیان زیندووتر و مرۆڤیش دڵگەشاوەتر ڕا دەگرێ.

"تۆماس مان"

268. درۆ وەك تۆپەڵە بەفر وایە، هەرچەندە زیاتر لەسەر بڕۆی گەورەتر دەبێ.

"لوتەر"

269. هاوڕێی تۆ کەسێکە هەر کاتێ قسەی هەقت لێ ببیسێ، توڕە نەبێ.

"فیساغۆرس"

270. هەندێکجار ئاشکرابوونی نهێنی لە ئەستۆی ئەو کەسەیە کە بۆ یەکەمجار درکاندوویەتی.

"کنگۆر"

271. هەرکەسێك بیر لە تۆڵەسەندنەوە بکاتەوە، بەردەوام برینەکانی خۆی هەڵدەداتەوە.

"باکرن"

272. باشترین شێوەی ژیان ئەوەیە مرۆڤ بڕوا بەخۆبوونی هەبێ و لەرێگەی هەوڵ و کۆششی خۆیەوە بگاتە پلە و پایەی شیاو تا قەدری بزانێ و هەوڵی لەدەست نەدانی بدا.

"میکلانژ"

273. هەڵەی خەڵکی تر وەك هەڵەکانی خۆت وەربگرە تا باشتر لەگەڵیاندا مامەڵە بکەی.

"فن لۆن"

274. مرۆڤی گەورە، فشار دەخاتە سەرخۆی، بەڵام مرۆڤی بچووك فشاری سەر خەڵك زیاددەکا.

"کونفسیۆس"

275. هاوڕێی راستەقینە ئەگەر لەبەر چاویش نەمێنێ، ئەوە لە دڵدا هەر زیندووە.

"سیسرۆن"

276. ئەنجامی کردارمان بۆ خۆمان دەگەڕێتەوە.

"نیچە"

277. ئەگەر حەز دەکەی متمانەت پێ بکەن، زۆر باسی خۆت مەکە.

"پاسکال"

278. سەرکەوتن بۆ ئەو کەسانەیە کە زیاترین خۆڕاگری دەنوێنن.

"ناپلیۆن"

279. تەنیا بێدەنگییە کە بەرەو تێگەیشتن هانمان دەدا.

"راما کریشا"

280. هەرکەسێك باشی و چاکەی خەڵکی تری لا گرینگ بێ، بێگومان خۆی دەگاتە بەختەوەری.

"ئەفلاتون"

281. مێوەی ئارامی بە داری بێدەنگییەوە دێ.

"جان کلامیزل"

282. هەناسەی مرۆڤی تووڕە، هەمیشە ژەهراوییە.

"کونفوسیوس"

283. دووربوون لە مرۆڤی شەڕانی، کردنەوەی دەروازەیەکی بەختەوەرییە.

"بتهوفن"

284. هەرکەسێك توانا و هاوسەنگیی خۆی پاراست، دەتوانێ بەسەر هەموو رووداو و کارەساتێکدا زاڵ بێ.

"د.مارۆن"

285. پاداشتی دۆستایەتی لە دۆستایەتیدا بدۆزەوە، لە چاکەدا بەدوای شتێکی تر جگە لە چاکەدا مەگەڕێ.

"هندو"

286. بەختەوەری تەنیا یەك پێناسەی هەیە، ئەویش بڕواکردن بە خودی بەختەوەربوونە.

"راشیلی"

287. ئەگەر دەتەوێ ژیان بناسی، سەرەتا خۆت بناسە.

"سوقرات"

288. بەهێزترین مرۆڤ کەسێکە پێش ئەوەی تورەبوون سەری بگرێ، دان بەخۆیدا دەگرێ.

"ئەفلاتون"

289. بیرکردنەوە، مرۆڤ بەرەو کرداری چاکە هان دەدات.

"؟"

290. هیچ بەهرەیەکی گەورە نادۆزییەوە کە ئیرادەیەکی گەورەی لەگەڵدا نەبێ.

"باڵزاك"

291. ئەزموون، ئەو قوتابخانەی قوتابییانی خۆی بەنرخێکی زۆر گران پەروەردە دەکا.

"فرانکلین"

292. زانست و زانین، کلیلی کردنەوەی هەموو دەرگەکانە.

"ئەناتۆل فرانس"

293. چ بەرد لە گۆزە بگری و چ گۆزە لە بەرد بدەی، لە هەر دوواندا هەر گۆزەیە کە دەشکێ.

"؟"

294. ئەوەی بڕوای بەخۆی هەبێ، پێویستی بە پێدا هەڵگوتنی کەس نییە.

"گوستاف لوبون"

295. لێبووردن لە هەڵە و ناڕاستییەکان، تۆڵەیەکی نەرم و دڵخوازە.

**"دیل کارنگی"**

296. ئەقڵ، ئەو هێزەی هەموو دنیا بەڕێوە دەبا.

**"ئامرسۆن"**

297. ئافرەت، ئەو فرشتەی لە منداڵیدا پەرستار، لە گەنجیدا خۆشیبەخش و لە پیریدا دڵداری پیاوانە.

**"لامارتین"**

298. لای پیاوی پاك، هیچ جۆرە ژنێك بێ رێز و ناپاك نییە.

**"میلتۆن"**

299. رەخنەی بێ بەڵگە، تەنیا لە دەسەڵاتی مرۆڤی بێ تواناداییە.

**"لامارتین"**

300. ویژدانت ناچار مەکە چاوپۆشی بکا لەوەی تاوانبارێکی شیاوی سزادان ئازاد بکرێ.

**"کۆکرل"**

301. لەهەموو ژیانتدا ناتوانی خۆشەویستییەکی باشتر، پاکتر و راستەقینەتر لەخۆشەویستیی دایکت بدۆزیتەوە.

"بالزاک"

302. ئەگەر ویستت هەڵسوکەوت و کرداری کەسێك تاقی بکەیتەوە، هێزی پیێ ببەخشە و دەسەڵاتی پیێ بدە.

"لینکۆڵن"

303. کاتێك مۆسیقات لە شیعر جیا کردەوە، دیارە لە مانای جیاوازی هەردووکیان دەگەی.

"ئازار پاد"

304. هیچ میراتێك دەوڵەمەندتر و بەنرختر لە کاری دروست نییە.

"شکسپیر"

305. هەرکەس تووشی هەڵەیەك نەبووبێ، هیچ داهێنانێکی بۆ نەکراوە.

"گالیلۆ"

306. راستی و دروستیت خۆش بوێ و لە هەڵە ببوورە.

"ڤۆلتێر"

307. شکست تەنیا بۆ ئەو کەسانەیە کە دەست لە کۆشش و هەوڵدان هەڵدەگرن.

"تۆماس"

308. زۆربەی دوژمنانی ئێمە ئەو کەسانەن کە زیاتر بێدەنگــن.

"ڤالری"

309. هەوڵ مەدە بە پێچەوانەی ئاراستەی با تف هەڵبدەی.

"نیچە"

310. کەس شایانی ئەوە نییە شەو بخەوێ تا لە خۆی بپرسێ ئەمڕۆ چیم کردووە تا شایانی ژیانی سبەی بم.

"شواتیرز"

311. جوانیی دیارییەکی سروشتە و هەر سروشت خۆی خاوەنێتی، نەکەن بەناوی خۆتان بڵاوی بکەنەوە.

"میلتۆن"

312. مرۆڤ بە هەرجار پێکەنین، چەند ڕۆژێك زیاتر دەخاتە سەر تەمەنی.

"؟"

313. سوود لە ئەمڕۆت وەربگرە و هەوڵ بدە کەمتر پشت بە سبەی ببەستی.

"هۆراس"

314. خواست و ئیرادە، یەکەم هەنگاوە بۆ گەیشتن بە ئامانج.

"فۆستەر"

315. تەمەنێکی درێژ لەوانەیە زۆر بەسوود نەبێ، بەڵام ژیانێکی سوودبەخش بەپێی پێویست سوودبەخشە.

"فرانکلین"

316. مرۆڤ ئەگەر نەیتوانی زیاتر لە ئێستەی پێش بکەوێ، لاواز و بێ توانایە.

"دانیل"

317. مرۆڤ ناتوانێ لەگەڵ هەموو کەسدا چاکە بکا، بەڵام دەتوانێ چاکە فێری هەموو کەسێک بکا.

"رولێن"

318. جوانیی دنیا پێوەستە بەهونەرە جوانەکان کە مایەی سەربەرزی و هۆی حەسانەوەی رۆح و گیانن.

"ئاناتول فرانس"

319. مرۆڤ دەتوانێ 2 خوولەك بێ هەوا، 2 حەوتە بێ ئاو و 3 حەوتە بێ خۆراك و تەمەنێکیش بێ پارە و پول بژی، بەلام ناتوانێ تەنانەت بۆ یەك سات بێ بیرکردنەوە و هزری نوێ بژی.

"فرانکلین"

320. بەختەوەری لە گرەوی 3 شت دایە، کار، خۆشەویستی و ئومێد.

"ئاگاتا کریستی"

321. گەیشتن بە حەز و ئارەزووەکان سەرکەوتنە و نەویستنی زیاتر لەوەی ئێستە هەمانە، بەختەوەرییە.

"لوس ئای"

322. پێویستە لەگەڵ دوژمنیشدا راوێژ بکەی تا پەی بە ئاستی دوژمنایەتییەکەی ببەی.

"سوقرات"

323. ئەلّماس تەنیا لە قووڵاییی ژێر زەویدا دەدۆزرێتەوە، بۆیە دەبێ ڕاستییەکانیش هەر لە قووڵاییی هزر و بیردا بدۆزرێنەوە و تەنیا بە بیرکردنەوەی سەرەتایی لە شتەکان نەدوێین.

"ئەفلاتون"

324. لەگەڵ کردنەوەی دەرگەی یەک قوتابخانە، دەرگەی بەندینخانەیەک دادەخرێ.

"هۆگو"

325. هەر وڵاتێک دانیشتووانی خاوەن زانست و تێگەیشتن بن، هەرگیز برسی نابن و ژیانیان ئاسوودەیە.

"کونفوسیوس"

326. ئەدەب شتێک نییە جگە لە هەڵسوکەوت و ئاخافتنی دڵسۆزانە.

"ڤۆلتێر"

327. تا لاوی کار بکە، چونکە تەنیا یەک بەهار لە ژیاندا هەیە تا سامانی هاوین، پائیز و زستانی تێدا دابین بکەی.

"بۆتن"

328. نێزیکترین ڕێگە بۆ گەیشتن بە ئامانج ، ڕێگەی ڕاستییە.

"تولستۆی"

329. کاتێک خۆمان بۆ خراپترین بارودۆخ ئامادە بکەین، ئیتر لە ناخۆشترین پێشهاتەکان نیگەران نابین.

**"ئەفلاتون"**

330. سواڵکەر هەرچەندە زیاتر ملی لار بکاتەوە، پتر درۆ دەکا و ناڕاستە لەوەی پێویستیی بە هاوکاری هەبێ.

**"؟"**

331. هەژاری دەبێتە کۆسپی سەر ڕێگەی پاکی و زیرەکی.

**"؟"**

332. لەناو کۆڕی گەورەکاندا، هەمیشە 3 خاڵت لەیاد بێ: کەم قسەکردن، کەم خواردن و پەلە کردن لە ڕۆیشتن تا ئەوپەڕی ڕێزت لێ بگیرێ.

**"ئەرەستو"**

333. کەسانی بەدگومان و دوودڵ، هەرگیز لە کارەکانیاندا سەرکەوتوو نابن.

**"ناپلیۆن"**

334. دەرمانی توورەیی، هەمان بێدەنگییە.

**"سوقرات"**

335. پێشبینی و دووربینی زۆر باشە، بەڵام ناکرێ لە ئەمڕۆوە خەمی ڕووداوەکانی داهاتوو بخۆی.

**"کارنگی"**

336. پێش چوونە ناو هاوسەرگیری، چاوەکانت باش بکەوە و بگەڕێ، بەڵام لەگەڵ دەستپێکی ژیانی هاوسەریتدا چاوەکانت زۆر باش بگرە.

**"فرانکلین"**

337. ئەگەر بە قەرزداری ئاهەنگی هاوسەرگیریت ساز کرد، ماڵئاوایی لە پێکەنین بکە.

**"؟"**

338. ژنی باش ئەو ژنەیە کە ئەوەی پیاوەکەی پێی خۆش بێ، ئەو زیاتر پێی خۆشە.

**"دوورتی کارنگی"**

339. هیچ شتێك لەوە خۆشتر نییە کە 2 هاوسەر لە ژیاندا لێك گەیشتنێکی باشیان پێکەوە هەبێ.

**"؟"**

340. خۆشەویستی، سپێدەی هاوسەرێتییە و هاوسەرێتیش شەوی خۆشەویستییە.

"بالزاك"

341. تەمەنی شانس وەك تۆپەڵە بەفرێکی سەر ئاگرێکی بەگوڕ وایە.

"؟"

342. هەزار لە چەند خۆشییەکی ژیان بێ بەشە، بەڵام چاو چنۆك لە هەموو خۆشییەکانی ژیان بێ بەشە.

"لابریفر"

343. راست نەکردنەوەی هەڵە، خودی هەڵەیە.

"کونفوسیوس"

344. ئەوانەی رابردوو لەبیر دەکەن، لە راستیدا ناچارن لە داهاتوودا هەمان رۆژانی رابردوو دیسان ببیننەوە.

"سانتا یانا"

345. ئەزموون، مامۆستایەکی گەورەیە کە یەکەم جار تاقیت دەکاتەوە و دواتر فێرت دەکات.

"؟"

346. هەمیشە کەموکورپیی خەڵکانی تر بۆ ئێمە دەبن بە مامۆستا.

"؟"

347. لە کۆمەڵگەدا ئەگەر رووتی و بێ جلوبەرگی و ئاڵۆزی مایەی شارستانییەت و پێشکەوتنە، ئەوە ئاژەڵەکان زۆر لەو کۆمەڵگەیە پێشکەوتووتر و شارستانی ترن.

"عەلی شەریعەتی"

348. هاوسەرێتی، خاڵی کۆتای خۆشەویستییە.

"ناپلیۆن"

349. هەڵبژاردنی هاوسەر وەك کاکڵی گوێز وایە، تا نەیشکێنی نازانی پووکە، تاڵە یان شیرینە.

"؟"

350. یەکەمین مەرجی سەرکەوتن ، ئازایەتی و بوێرییە.

"کامبل"

351. ماندووبوون و ئازار چێشتن، زۆر زیاتر لە مردن پێویستیی بە ئازایەتی هەیە.

"ناپلیۆن"

352. کاتێك خۆم بە ئازا دەزانم، کە پاش هەر شکستێك بزەیەك بخەمە سەر لێوەکانم.

"ناپلیۆن"

353. ترسنۆك، ئەو کەسەی بێدەنگە لەو کاتەیدا پێویستە قسە و ویستەکانی خۆی بخاتە بەر گوێی هەموان.

"لینکۆڵن"

354. مرۆڤە ئازا و بوێرەکان فەرمانڕەوای دنیان.

"؟"

355. لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ، ئازایەتییە.

"فیستەر"

356. ململانێ لەگەڵ گیروگرفتەکانی ژیاندا، لە ئامانج نێزیکتر دەکا و دووربینییەکی قووڵترت پێ دەبەخشێ.

"همینگۆی"

357. ئەگەر بزانین لە کوێین و بۆ کوێ دەچین و چۆن دەچین، یەکێك لە گرفتەکانی خۆمان و کۆمەڵگەمان چارەسەر کردووە کە سەرجەم جیهان بەدوایدا وێڵە.

"لینکۆڵن"

358. تەنیا سامانێك كە بایەخی هەوڵدانی بۆ هەبێ، ئامانجە.

**"لوكی گاستۆنی"**

359. تەنیا كارێك لە ژیاندا مرۆڤ بەرەو ئامانج دەبا، ئەویش جێبەجێكردنی ئەركەكانی سەرشانیەتی.

**"بانو ئاستاهل"**

360. ئەو ئامانجەی بناغەیەكی راستەقینەی نەبێ، بەدەست نایەت.

**"ئامرسۆن"**

361. هەوڵدان و كۆشش بۆ گەیشتن بە سەركەوتن، لە خودی سەركەوتنەكە خۆشترە.

**"؟"**

362. بەبڕوای من، ئازایەتیی راستەقینە، خۆڕاگرییە لە بەرامبەر كارەسات و گرفتەكانی ژیاندا.

**"ناپلیۆن"**

363. لە كێشە و دەمەقاڵێدا، یەكسانی لە سەرووی هەموو شتێك دابنێ.

**"؟"**

364. ئامانج پیرۆزە و بە هەر شێوەیەك بێ هەوڵی پێگەیشتنی بدە.

"؟"

365. ئەگەر ژیانت خۆش دەوێ، کات بە فیڕۆ مەدە، چونکە ژیان خۆی لە کات دروست بووە.

"بروسلی"

366. ژیان بەبێ ئامانج، خۆ بەدەستەوەدانی قەدەر و چارەنووسە.

"سنیك"

367. لە هەموو ژیانمدا تەنیا داخی شتێك هەیە، ئەوەی جگە لە گیانم هیچی تر شك نابەم پێشکێشی گەورەیی نیشتمانەکەمی بکەم.

"تسلونی"

368. لە ناپلیۆنیان پرسی، چۆن توانی ئەو متمانە بەخۆبوونە بۆ سوپاکەت دروست بکەی، گوتی: ئەگەر یەکێك بیگوتبایە ناتوانم، دەمگوت هەوڵ بدە، ئەگەر بیگوتبایە نازانم، دەمگوت فێر بە و ئەگەر بیگوتبایە مەحاڵ و نامومکینە، دەمگوت تاقی بکەوە.

369. هیچ شتێك هێندەی پێدا هەلگوتن و پێدا هەڵدان کار ناکاتە سەر منداڵ.

"شکسپیر"

370. پیاوانی گەورە کەمتر قسە دەکەن و زیاتر کار دەکەن.

"کۆنفوسیوس"

371. من نرخی بێدەنگیم زانی و ئامادەم لەسەر ئەم بابەتە رۆژانە چەندان کاتژمێر قسە بکەم.

"جۆرج برناندشۆ"

372. ئەوەی رێگەی بێدەنگی گرتەبەر، گیانی خۆی دەرباز کردووە.

"؟"

373. ژنی لاڵ و بێ زمان، هەرگیز لەلایەن هاوسەرەکەیەوە لێی نەدراوە و ئازار نادرێ!

"؟"

374. زمانی مرۆڤ وەك مار وایە کە جەستەی خۆیشی هەم دەگەزێ.

"گوگول"

375. بێدەنگی و قسەکردن لە شوێنی خۆیدا، ئەوپەری زیرەکی و هۆشمەندییە.

"سوقرات"

376. یەکسانی دەبێ بچەسپێ، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەنجامەکەی.

"سنیك"

377. یەکسانی، چاوەڕوانیی پاداشت و سوپاس ناکا، ئەم کارە خۆی بەدیهێنەری شادی و بەختەوەرییە.

"مەترلینگ"

378. بێدەنگی، جۆرێکە لە گفتوگۆکردن کە هەرگیز هەڵەی تێناکەوێ.

"؟"

379. بۆ ئەوەی بتوانی بەباشی ئاخاڤتنەکانت هەڵسەنگێنی، دەبێ کەمتر بێیە قسەکردن.

"کریستین"

380. قسەکردن و گفتوگۆ، جۆرێکە لە پێداویستیی مرۆڤ، بەلام گوێڕایەڵی هونەرێکی جیاوازە.

"گوتە"

381. مرۆڤ دەبێ لەگەڵ خەڵکدا کەم و لەگەڵ خۆیدا زۆر بدوێ.

"؟"

382. کەسی باش شەرم دەکا گوێبیستی پێهەڵگوتنی خۆی بێ، بێدەنگە لەوەی بەخراپ باسی دەکەن.

**"جبران خليل"**

383. راستییەکان لە بێدەنگیدا دەدۆزرێنەوە.

**"پابلۆ بیکاسۆ"**

384. پەیڤ و وشەکان باڵ و پەڕیان هەیە، هەرکە لە دەمت دەرئەچن، بچووکترین درزەکان ئەدۆزنەوە و گەورەترین دیوارەکان تێپەڕ دەکەن.

**"ئاڵفرد نۆبل"**

385. لە وەسفکردنی بایەخی ژندا، هەر ئەوەندە دەتوانم بڵێم کە ژیان بەبێ ژن تەحەمول ناکرێ.

**"ئەناتول فرانس"**

386. ژنی لێزان، ماڵ ئاوەدان دەکا و ژنی نەزانیش وێرانی دەکات.

**"تریستان برنارد"**

387. ژیانی ژن برێتییە لە هەستیاری و ئەڤین و فیداکاری.

**"بالزاك"**

388. ئەوەی لە دڵی ژندایە و دڵی پیاو داگیر دەکا، زیاتر میهرەبانییەکەیەتی نەك جوانیی.

"شکسپیر"

389. جوانیی راستە و راستیش جوانە.

"کیتس"

390. بۆ سەلماندنی شارستانییەت و پێشکەوتنی هەر میللەتێك، ئاستی تێگەیشتنی ژنەکانیان هەڵسەنگێنە.

"ناپلیۆن"

391. ئەگەر ژن نەبووایە، بلیمەتەکانی جیهان هەرگیز بوونیان نەدەبوو.

"ناپلیۆن"

392. ژن کلیلیماڵەوەیە، ئاگەداربە ونی نەکەی.

"؟"

393. کلیلی بەختەوەری لەوەدایە کە ئەرکەکانی سەرشانت بە دروستی ئەنجام بدەی.

"هیکسلی"

394. دڵنیــام لـــه‌وه‌ی به‌ختـــه‌وه‌ریی كۆمه‌ڵگـــه‌ زۆر گـــرینگتر و سوودمه‌ندتره‌ له‌ به‌خته‌وه‌ریی تاك.

**"ئه‌فلاتون"**

395. به‌خته‌وه‌ری له‌وه‌دا نییه‌ كه‌ توانات چه‌نده‌، بگره‌ له‌وه‌دایه‌ كه‌ تا چه‌ند سوود له‌ توانه‌كانت وه‌رده‌گری.

**"؟"**

396. به‌ختـه‌وه‌ری وه‌ك هـه‌ر لایـه‌نێكی تـر لـه‌ ئـه‌نجامی 2 شـتدایه‌: رازیبوون و هه‌وڵدان.

**"ڤۆلتێر"**

397. بـه‌وجۆره‌ی گـوڵ بـۆ پـشكووتن پێویـستی بـه‌ ئـاو هه‌یـه‌، به‌خته‌وه‌ریش به‌بێ خۆشه‌ویستی دروست نابێ.

**"گوره‌كی"**

398. ژن، پیـاو بـه‌ چـــاوه‌كانی هه‌ڵده‌ســه‌نگێنێ و پیـاویش، بـه‌ ئـــه‌قڵ ژن هه‌ڵده‌سه‌نگێنێ.

**"ئه‌ناتول فرانس"**

399.شادی و خۆشحاڵی کاتێك باڵ بەسەرماڵێکدا دەکێشێ کە تێیدا میهرەبانی و خۆشەویستی هەبێ.

"شکسپیر"

400. خۆشی، شادی و ئارامی ناهێنیتەدی، بگرە سەرکەوتنەکانن شادی و ئارامی بە دەروون دەبەخشن.

"رۆت کێرت"

401. پۆشاکی مرۆڤی بەختەوەریان لە رووخۆشی، چاکە، سازگاری و مرۆڤدۆستی رستووە.

"بوزمر جمهور"

402. ئەو شادییەی بەخەڵکی دەبەخشین، سەرەنجام هەر بۆ خۆمان دەگەڕێتەوە، وەرن خۆمان شاد بکەین.

"بتهۆڤن"

403. بەختەوەری، تاکە بەهرەیەکی مرۆڤە بێ ئەوەی خاوەنی بین دەتوانین کەسانی تری لێ بەهرەمەند بکەین.

"کانت"

404. ژیان لەگەڵ سرووشتدا، ئەوپەڕی بەختەوەرییە.

"تولستۆی"

405. مردن بە راوەستاوی، زۆر باشترە لە ژیانی سەر چۆك.

"دولۆرس بارفێری"

406. مرۆڤی بەختەوەر ئەو کەسەیە کاتێ لەخەو هەڵدەستێ بەخۆی بڵێ: هەوڵ دەدەم ئەمڕۆ لە دوێنێ باشتربم.

"ئفلتون"

407. ئەگەر بە تەواوی لە مانای ژیان تێ بگەی، بەختەوەربوونی ژیانت مسۆگەر دەکەی.

"تولستۆی"

408. مەرگ لە کاتی شەڕدا زۆر باشتر و جوامێرانەترە لە ریسوابوونی ناو رۆژانی شەڕ.

"مەترلینگ"

409. ئەگەر لە بڕی چەك، بە قەڵەم و نووسین بجەنگن، هەموو دوژمنەکان لەناو دەچن.

"بسمارك"

410. بە گوتنی تەنیا دروشمی ئاشتی ئاشتی ئاشتی...، ئاسایش و هێمنی جێگری نابێ.

**"ناپلیۆن"**

411. شیعر کاتێك لە ئاواز دوور کەوت، وشك دەبێتەوە.

**"ئازار پاد"**

412. ئارەزوومە تا سەرەمەرگم سوودبەخش بم و ئەگەر کاتێك هات کە سوودم نەبێ، ئەوسا مەرگم بگات.

**"ج. برناندشۆ"**

413. پێم بڵێن بەر لە هاتن بۆ ئەم دنیایە لە کوێ بوون تا پێتان بڵێم لە پاش مردن بۆ کوێ دەچنەوە.

**"شوپنهاور"**

414. شەڕ، دز و چەتە و ڕێگر دروست دەکا و لە بەرامبەریشدا ئاشتی هەمووان بنبڕ دەکا.

**"ماکیا ڤیلی"**

415. لە کاتی جەنگدا ئەگەر لە مەرگ نەترسی، بە دڵنیاییەوە سەرکەوتن بەدەست دێنی.

**"هۆگۆ"**

416. سەربەرزی و شانازی لەوەدایە دلۆپە فرمێسکێك بسڕیتەوە، نەك لافاوی خوێن بەرپا بکەی کە شەرمە.

"بایرۆن"

417. هێندە شکستم هێنا تاکو ڕێگەی شکستدان فێر بووم.

"ناپلیۆن"

418. خوێندنەوەی کتێبێکی چاك و بەسوود، لە ڕاستیدا وتووێژکردنە لەگەڵ مرۆڤێکی پاك و دروستدا.

"دیکارت"

419. ژووری بێ کتێب، وەك جەستەی بێ گیان وایە.

"سیسیرۆ"

420. لە هەر شوێنێك مرۆڤ هەبوو، پێویستە کتێبیش هەبێ تا دەرگەکانی زانین بەڕووی مرۆڤدا بکرێنەوە.

"؟"

421. تا ئەوکاتەی خوێندنەوە نەبێتە بەشێك لەژیانی کۆمەڵ، کۆمەڵگەیەکی سەرکەوتوو و شیاو نایەتەدی.

"سوقرات"

422. بڕبڕەی پشتی پێشکەوتن لەم سەردەمەدا، کتێب و ڕۆژنامەگەرییە.

**"ڕۆزڤێلت"**

423. خۆسازدان بۆ جەنگ، لە ڕاستیدا هەوڵێکە بۆ جێگیرکردنی ئاشتی.

**"جۆرج واشنتۆن"**

424. ئەوەی جەنگ دەکاتە سەرمەشقی ژیان، جگە لە بێ بەزەیی و توندوتیژی هیچی تری لێ ناوەشێتەوە.

**"تولستۆی"**

425. مرۆڤ تەنیا 2 ئەرکی هەیە، خزمەتکردنی وڵات خزمەتکردنی مرۆڤایەتی.

**"هۆگۆ"**

426. شار داستانە و نیشتمان غەزەل، کاتێك ئەم دووانە یەك دەگرن جوانترین سەمفۆنیا پێك دێنن.

**"لانك فلۆر"**

427. هیچ خۆشەویستییەك گەورەتر لە خۆشەویستیی وڵات نییە.

"ئەفلاتون"

428. وانەی نیشتمانپەروەری پێویستە لە قوتابخانەکاندا فێری منداڵان بکرێ.

"میشلە"

429. ئەو مێوەی دەستمان پێدەگا خۆشترە لەوەی بەدارەوەیە، بەڵام چونکە دوورە ئەومان پێ خۆشترە.

"ڤولتێر"

430. هونەرمەندی راستەقینە خۆی دەشارێتەوە هونەرەکەی دەردەخا، ئەمەیە ئامانجی سەرەکیی هونەر.

"ئوسکار وایڵد"

431. مۆسیقا، هەڵقوڵاوی هزر و بیرە کە بە ئارامی لەسەر لووتکەی دڵ دەنیشێتەوە.

"بتهۆڤن"

432. ئەوەی لە بینینی شانۆیەکدا فێری دەبی، ناتوانی لە خوێندنەوەی کتێبێکی گەورەدا بەدەستی بێنی.

"ڤولتێر"

433. زانست و هونەر تایبەت بە یەك نەتەوە یاخۆ ولاتێك و قۆناغێکی تایبەت نین، بگرە هی هەموو جیهانن.

"پۆشکین"

434. ئەوەی بە دەست کار دەکات کرێکارە، ئەوەی بە دەست و ئەقڵ کار دەکا پیشەوەرە، بەڵام ئەوەی بە دەست و ئەقڵ و هەستەکانی کار دەکا، هونەرمەندە.

"پۆشکین"

435. خۆت بپارێزە لە وردە خەرجی لاوەکی، چون درزێکی بچووکیش دەتوانێ کەشتییەکی گەورە نقووم بکا.

"فرانکلین"

436. هونەر، بانگەوازێکە بەرەو خۆشی و بەختەوەری.

"شیلتەر"

437. هونەر، شیلەی ژیانە.

"پل ڤارلی"

438. هـونـەر، تاکە زمانی هاوبەشی نێوان سەرجەم هونەرمەندانە.

"بتهۆڤن"

439. جوانییـەکانی دنیـا لـە گـرەوی هونـەرە جوانەکانـدان، هونـەر مایەی شانازی و ئارامیی مرۆڤەکانە.

"ئەناتۆل فرانس"

440. ئەگـەر لایـەنگری هونـەری، بـە دڵنیاییـیـەوە مرۆڤێکـی چـاك و چاکەخوازی.

"مارسێل برۆست"

441. هـونـەر، کلیلی تێگەیشتنە لە ژیان.

"ئوسکار وایڵد"

442. هـەرگیز نـاتوانی بـە پـوڵ و پـارە، سـەربازێکی وەفـادار، مامۆستایەکی دڵسۆز، هونەرمەندێکی بەتوانا و کرێکارێکی باش پەیدا بکەی، دۆزینەوەی ئەوانە کاری مرۆڤە.

"روسکین"

443. کەسانی بێ ئەزموون، پارە و پوڵ بە دوا چارەسەری کێشەکان دەزانن.

"رازیلقی"

444. بوون بە بازرگان ئاسانە، بەڵام هونەرەکە لەوەدایە لەسەر ئەو بازرگانییە بەردەوام بی.

"؟"

445. هەرکەس پارە و سەرمایە بخاتە خزمەت زانست و پێشکەوتن، بێگومان چەند هێندە زیاتری دەست دەکەوێ.

"؟"

446. گوی زەوی بۆ خەڵکانی خاوەن هەوڵ و کۆششە.

"؟"

447. هەوڵ بدە نقومی ناو کارکردن بی، تا نەکا لە بێ هیواییدا نغرۆ بی و لەناو بچی.

"دیل کارنگی"

448. ئازادیی پێشکێشی ئەو کەسانە دەکرێ کە بەدوایدا وێڵن.

"ڤبستر"

449. هەروەك پێم خۆش نییە كۆیلە و دیلی هیچ كەس بم، بێزارم لەوەی ئاغا و كۆیلەدار كەسی تریش بم.

"لینكۆڵن"

450. ژیان گوڵە و خۆشەویستی شیلەی گوڵەكەیە.

"هـــۆگـــۆ"

451. لە شەڕ و خۆشەویستیدا، هەموو شتێك ڕەوایە و هیچ سنوورێك نامێنێ.

"فرانكلین"

452. ئەوەی هیچ دارایی و سامانێكی نییە، خۆ بەلایەنی كەمەوە خۆی بوونی هەیە!

"فرانكلین"

453. بە گومان و دوودڵ بوون، هیچ كارێك پێش ناكەوێ.

"ناپلیۆن"

454. چارەڕەشیی مرۆڤ لە تەمبەڵ بوونی خۆیدایە نەك لە نەزانینی.

"دیل كارنگی"

455. خواست و هێزی ئیرادە و بوێریی خۆم بوو کە منی گەیاندە ئەمڕۆ.

"ناپلیۆن"

456. سەرکەوتنەکانم لەوە دەزانم، هەمیشە چارەگە سەعاتێك بەر لە کاتی کار لە شوێنی خۆم ئامادە بوومە.

"ماندێلا"

457. بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتن 3 شت پێویستە، یەکەم ئیرادە، دووەم ئیرادە و سێیەم هەر ئیرادە!

"لۆرد ئاڤیبوری"

458. ئەگەر ئەرك بە کەسێك بسپێری کە حەزی لێیەتی و بەدڵی خۆی ئەنجامی بدا، زۆر چێژ لە ئەنجامدانی وەردەگریّ و خونچەی تواناکانی دەپشکویّ و بەرهەمی باشی لیّ دەکەوێتەوە.

"روسکین"

459. خۆت کار بکە، بەر لەوەی پێویستی بە کار و نەداری ناچارت بکا کار بکەی.

"فرانك"

460. مرۆڤی نەزان، لە کاری هەموو کەسدا خۆی بەرپرس دەزانێ و قسەی لێ دەکا، جگە لە کارەکەی خۆی.

"ئەڵمانی"

461. گەورەترین شانازی، ئیمانە.

"؟"

462. گەورەترین بەهرە، هەبوونی منداڵی باشە.

"؟"

463. گەورەترین دیاری، لێبووردنە.

"؟"

464. گەورەترین سەرمایە، متمانە بەخۆ کردنە.

"؟"

465. گەورەترین نهێنی، مەرگە.

"عەلی د.خ"

466. گەورەترین مامۆستا، ئەزموون و تاقیکارییە.

"عەلی د.خ"

467. ئەو کەسەی بیر لە داهاتوو دەکاتەوە، لە راستیدا کلیلی بەرگریکردنی ناخۆشییەکانی لە دەستدایە.

"کنفوسیۆس"

468. جوانتر لە هەموو شتە جوانەکانی دنیا، گیان بەخشین و مردن لە پێناو نیشتماندایە.

"ئەبوو موسلم"

469. کارکردن، سەرمایەی بەختەوەرییە لە ژیاندا.

"سوقرات"

470. کارکردن بووکی ژیانە، ئەگەر هاوسەرێکی باشی ئەو بووکە بی، بێگومان بەختەوەری دەبێتە مندالّتان.

"فرانکلین"

471. راشکاو و کراوەبوون لە کارکردا، نیوەی ئەنجامدانی کارەکەیە بەر لەوەی دەستی پیّ بکەی.

"شیلێر"

472. ئەوانەی دەڵێن کاتمان نییە، هەر ئەوانەن کەمتر کار دەکەن.

"شوپن هاور"

473. ئەگەر بەردەوام لەم چڵ بو ئەو چڵ بفڕی و جێگیر نەبێ، بێگومان هیچ کات ناگەیتە ئامانج.

**"بالانش"**

474. ئەگەر کارەکانت دابەش بکەی و هەرجارەی بەشێکی لێ ئەنجام بدەی، کارەکەت ئەستەم نابێ.

**"هنری فۆرد"**

475. مرۆڤی ئەمڕۆ، بەرهەمی کار و کۆششی رۆژی رابردووی خۆیەتی.

**"داروین"**

476. هیوا و دان بەخۆداگرتن، کلیلی گەیشتن بە ئارەزوو زێڕینەکانن.

**"دۆما"**

477. لە کاتی لاویدا تێ بکۆشە و ماندووبە، تا لە رۆژانی پیریدا بتوانی پشوویەك بدەی.

**"ناپلیۆن"**

478. هەرکەس ئومێدی لە دەست دا، زۆر شتی تریش لە دەست داوە.

"؟"

479. ئەوەی بێزارمان دەکا نەبوونی ئومێد و هیوایە، نەک ئەوەی پیر بووینە و خۆشییەکان بەکۆتا هاتوون.

"شکسپیر"

480. هەرکات هەستم بە نەساغی و ئێش و ئازار کرد، پەنا بۆ کارکردن دەبەم کە باشترین دەرمانە.

"ڤۆلتێر"

481. ئەو دڵەی یادی خودای گەورەی تێدا نەکرێ، دادگەیەکی بێ دادوەرە.

"ژان ژاك روسۆ"

482. زۆر درانگ لەو راستییە دەگەین کە ژیانی راستەقینە هەمان ئەو ساتانە بوون کە بە پەلە و خێرا تێپەڕین و ئێمە چاوەڕوێی شتی تر بووین، ئیتر ئەو کات هیچ چارەیەکمان نییە جگە لە سەلماندنی ئەم ناخۆشییە.

"دیل کارنگی"

483. هیچ کەس ناتوانێ هێمنی و ئاسایشی ژیانمان بشێوێنێ، مەگەر خۆمان ئەو ڕێگەیەی پێ بدەین.

"دیل کارنگی"

484. ئەگەر 500 سەرم پێوە بێ، هەموویان لە ڕێگەی هەق و دادپەروەریدا بەخت دەکەم.

"مارتین لۆتر"

485. یەك ڕۆژ ژیانی بەر ڕووناکیدا، خۆشترە لە سەد ساڵی ژیانی ناو تاریکی.

"بودا"

486. ئومێد بۆ مرۆڤ لە ژیاندا وەك باڵ بۆ باڵدار وایە.

"ڤیکتۆر هۆگۆ"

487. ژیان هەمیشە بەدڵی خۆت نابێ، تەنیا بە پشوودرێژی دەتوانی بەسەر هەموو ناخۆشییەکاندا زاڵ بی.

"برنارد شۆ"

488. لە ژیاندا، سۆز و میهرەبانی سەرمایەن و خۆپەسندی و خۆ بەزلزانین، هەژاری و بێکەسین.

"فینە"

489. کەم بژی، بەڵام جوان و پڕمانا بژی.

"هۆلارو"

490. خۆشیی ژیان لە هەر 3 چەمکی: کرداری چاك، ئاخافتنی چاك و هزری چاکدایە.

"زەردەشت"

491. ئیرادە و خواست، تاکە راستییەکە و لە دڵی هەموو شتێکدا هەیە.

"شوپنهاور"

492. ناخۆشییەکانی ژیان فەرامۆش بکە و بە ئامێزێکی کراوەتر بەرەو پیلی ژیان برۆ.

"شکسپیر"

493. گەورەترین گوناە، ترسە.

"عەلی د.خ"

494. هەرکەس رۆژانە ماوەیەکی کورت بیر لە باشترکردنی ژیانی بکاتەوە، گوزەرانی سبەی لەمڕۆ خۆشترە .

"ڤۆلتێر"

495. تا دەتوانی لە ژیاندا شادان بە، خۆت لە بیر و هزری بێ سوود و بێ ئومێدی بپارێزە.

**"چارلز دیکنز"**

496. گەورەترین خۆشگوزەرانی، کارە.

**"عەلی د.خ"**

497. ژیان، بریتییە لە گەڕان و سووڕانی هەمیشەیی.

**"لامارتین"**

498. فرمێسکی دۆست لە پێکەنینی دوژمن بەنرخترە.

**"؟"**

499. دۆست، ئاوێنەی سەرکەوتنەکانی تۆیە.

**"؟"**

500. قاز زۆر نەزانە ئەگەر لە دوورەوە ڕێوی نەناسێ.

**"؟"**

501. ڕێوی هەرگیز لە نێزیك لانەی خۆیدا ڕاو ناکا.

**"؟"**

502. ئەو وشترەی ئارەزووی چوونە سەر کێو و گەشتی شاخ بکا، گەردنی خۆی بەبڕین دەدا.

"یـۆنـانی"

503. نرخی بەهاری ڕۆژانی گەنجێتی بزانە، لەناو بـەهاری سروشـتدا بەخۆشی بەهاری تەمەنت بەسەر ببە.

"دیل کارنگی"

504. بەداخەوە بەهای ئاو کاتێك دەردەکەوێ کە کانیاوەکـان وشـك بوونە.

"؟"

505. بـــۆ پێکهێنـــانی ژیـــانی هاوبـــەش، پەلـــەکردن هەڵەیـــە و دواخستنیشی هەڵەیەکی تر.

"؟"

506. کاتێ منداڵی خۆت لـە ئـامێز گـرت، ئـەوجا لـە خۆشەویستیی دایك و باوکت بەرامبەر خۆت دەگەیت.

"؟"

507. ئەگەر سەر لە بەیانی بەپێی چەپەوە لە ناو پێخەفەکەت دەربچی، ئەو ڕۆژە هەمووی هەر لە ناخۆشیدا دەبی.

"؟"

508. لە جەنگدا، خودا هەمیشە پشتیوانی لایەنی بە هێزتری شەڕە !

"ئینگلیزی"

509. ڕشتنی فرمێسك و ئارەقە و خوێن، هەرگیز بێ ئەنجام نامێنێتەوە.

"؟"

510. تەنیا کەسێك سەرکەوتوو دەبێ کە چاوەڕێی کەس نییە جگە لە خۆی.

"شیللر"

511. لە کۆکردنەوەی هاوڕێ و دوورکەوتنە لێیان، زۆر پەلە مەکە.

"سوڵدن"

512. بیر لە ژیان بکەوە، بەڵام خەمی بۆ مەخۆ.

"دیل کارنگی"

513. دڵۆپێك هەنگوین زیاتر لە جامێك سرکە مێش لە دەوری خۆیدا کۆ دەکاتەوە.

"ئەمریکی"

514. کەمێك پشوو بدە تا زووتر بگەیتە ئەنجام.

"فرانکلین"

515. ئەوەی ئازایە، هەمیشە وریایە.

"؟"

516. زۆر چەنەلێدان، جۆرێك سەرکەوتنی لێ دەکەوێتەوە!

"؟"

517. ئەوەی لە خودا نەترسێ، مانای پاڕانەوەش نازانێ.

"؟"

518. مرۆڤ، تا ئەوکاتەی وەك ئاو ڕەوانە و لە جووڵانەوە دابێ، نوێ و پاکە.

"ئەمرۆ"

519. مرۆڤ هەرگیز خۆ بەدەست مەرگەوە نادا، تا ئەو کاتەی تەواو ئیرادەکەی لاواز دەبێ.

"ئیدگار ئالن پو"

520. ئەگەر ناپیاوێك خۆی بۆ کردی بە پرد، بەسەر پشتی دا برۆ!

"؟"

521. چاوپۆشی لە هەڵەی گەورەی دۆستەکانمان، نیشانەی دوژمنایەتییە نەك دۆستیایەتی.

"؟"

522. مرۆڤ خۆی ناناسێ، تا ئەو کاتەی نەکەوێتە ناو تەنگانە و چەرمەسەری.

"ئالفردۆ مۆسە"

523. میوا و ئارەزوو، نان و خۆراکی رۆژانەی هەژارانە.

"هرشل"

524. زانا هەرچی دەیزانێ نایڵێ، بەڵام ئەو شتانە دڵێ کە دەیزانێ.

"ئەرەستو"

525. ڕاستی، وەك ئەفسانەیە کە هەموو کەس باسی دەکات.

"لارۆ شفۆکۆ"

526. خۆشەویستی، سەرەتای هەیە، بەڵام کۆتای نییە.

"لارۆ شفۆکۆ"

527. چـاوەکان ئەگـەر لووتیـان لـە نێـوان نەبووایـە، یـەکتریان دەخوارد.

"؟"

528. دوژمن، ئەگەر بچووکیش بێ هەر کاری گەورە دەکا.

"؟"

529. هەرکەس لـە قـسەکردندا زمـانی درێـژ بـوو، ئـەوە لـە کـرداردا دەستی شکاوە.

"فەرەنسی"

530. سەبرکردن و لێبووردەیی، گوڵێکن ناکەونە باغی هەموو کەس.

"ئەمریکی"

531. ئەوەی چاکە و باشەت لەگەڵدا دەکا دەتبەستێتەوە، بەڵام ئەوەی خەراپەت لەگەڵدا دەکا، ئازادت دەکا لەوەی بەرامبەری هەموو شت بکەی و پابەندی زۆر شت نەبی.

"؟"

532. کاتێك شتێك دەبەخشی، لاڵ و بێدەنگ بە، ئەگەریش شتێکت وەرگرت، باسی بکە.

**"ئیسپانی"**

533. لە هەموو کەس زاڵمتر ئەو کەسەیە سەر دانوێنێ بۆ کەسێك کە هیچ ڕێزی لێ ناگرێ.

"؟"

534. بۆ زانای ئایینی، هیچ شتێك لە قەناعەت و ڕەزامەندی لە دەست کورتیدا جوانتر نییە.

"؟"

535. زانست ئەوە نییە تەنیا فێری بی و بیزانی، دەبێ سوودی هەبێ و کاری پێ بکەی.

"؟"

536. کەسێك کە بەهۆی پیاوچاکی و بەجێهێنانی ئەرکە ئاینییەکان بەڕێز و گەورە نەبێ، هیچ کات گەورە نابێ.

"I"

537. تەنیا ئەوانەی شیوەن و زاری دەکەن، دەتوانن قەدری جوانی و بەختەوەری بزانن و جوان پێکەنن.

"ئۆرینا فالاچی"

538. شایی و خۆشی لە ماڵێکدا هەیە کە خۆشەویستی تێدابێ.

"ئەرەستو"

539. پەژارە و پەرێشانی مەرگی رۆحە و پێکەنین ژینەوە بە رۆح دەدا.

"لوقمانی حەکیم"

540. پێکەنینی نەدار و هەژاران لە دەوروبەری لێویان زیاتر تێ ناپەڕێ.

"شەمیل زولا"

541. گرینگترین و گەورەترین شانازیی من، وەپێکەنین خستنی خەڵکی خەمبارە.

**"چارلی چاپلین"**

542. ئەوە مرۆڤە پارە و پوڵ پەیدا دەکا، خۆ پوڵ و پارە ناتوانن مرۆڤ دروست بکەن.

**"ئێرانی"**

543. هەموو کەسێك دەتوانێ لە دەریای مەند و ئارامدا مەلە بکات.

**"ئینگلیزی"**

544. ئەو نەتەوەی زمانی خۆی بەباشی دەزانێ، ئەگەریش ببێتە کۆیلە و دیلی نەتەوەیەکی تر و داگیر بکرێ، وەك بەندییەك وایە کە شاکلیلی بەندینخانەکەی لە گیرفاندا بێ و هەموو کات دەتوانێ خۆی دەرباز بکا.

**"ئەلفۆنس دودە"**

545. منداڵ هەرچەند ناتەواوتر و کەموکوڕی زیاتر بێ، خۆشەویستترە.

**"رووسی"**

546. ئەگەر حەز دەکەی هەرگیز بەرامبەر دادوەر دانەنیشی، هەمیشە لەپشت یاساوە بە ئارامی هەنگاو بنێ.

"ئینگلیزی"

547. خۆش رابواردن لە خانوویەکی بچووك و هەژارانەدا، لە گریانی ناو کۆشکێکی رازاوەدا زۆر خۆشترە.

"فەرەنسی"

548. ناخۆشترین و تاڵترین رۆژ لە تەمەنی ئێوەدا ئەو رۆژەیە کە هەرگیز پێ نەکەنی.

"شالتور"

549. شیوەن و زاری ئاسانە، بەڵام پێکەنین زۆر ئەستەمە.

"مولیر"

550. لەبەهاری تەمەندا، خۆتان بە بەهار و خۆشییەکانی بەهار بسپێرن، خۆتان بکەن بەگوڵێك لە گوڵەکان.

"لامنایس"

551. گەورەیی، شانازیکردن بە باوکتان نییە، دەبێ خۆتان گەورەییەکی نوێ بەدەست بێنن.

**"کاموئینس"**

552. ملهۆڕ و کەللەڕەق ئەو کەسەیە بۆ لێکردنەوەی سێوێك، دارەکەی لە ریشەوە دەربێنێ.

**"مینتیسکۆ"**

553. دوگمەیەکم پێ بدەن، دەتوانم کارێك بکەم خەڵك بیپەرەستن و لە پێناویدا گیان فیدا بکەن.

**"ناپلیۆن"**

554. کەسێك لە وەستاکەی وریاتر و کارزانتر نەبێ، شاگردێکی هەژارە.

**"لئۆناردۆ"**

555. ریز و حورمەت گرتنی لەڕادەبەدەری هەرکەس، دەبێتە کەم بوونەوەی ریز و حورمەتی خودی خۆت.

**"هاوار بازیان"**

556. لای خەڵك باسی تەمەنی خۆت مەکە، چونکە ئەگەر کەم بێ بەبچووك و ئەگەر زۆریش بێ، بەگەورەت تێدەگەن.

"؟"

557. خۆتان پاك و خاوێن رابگرن تا خەمتان کەم بێ و خۆتان بۆن خۆش بکەن تا زیاتر سوود لە ئەقڵتان وەربگرن.

"؟"

558. چارەڕەشی و نەداری لەوەدا نییە مرۆڤ کوێر بێ، بگرە لەوەدایە نەتوانێ بەرگەی کوێربوون بگری.

**"جان میلتۆن"**

559. خودا 2 چاو و 1 زمانی بە مرۆڤ بەخشیوە، تا 2 هێندی بەزمان قسە دەکات، بە چاو ببینێ.

**"ئیدمۆند گۆڵدن"**

560. کە ناتوانی بەڕاستی و دڵسۆزییەوە بۆ کەسێك بگری، هەوڵ مەدە بەزۆری فرمێسکی بۆ هەڵوەرێنی.

**"هاوار بازیان"**

561. مەرگ بۆ رزگاربوونی مرۆڤ لە خەم و چارەڕەشی و زوڵم و زۆرداری، باشترین پشت و پەنایە.

"سادق هیدایەت"

562. دنیا کتێبێکی جوانە، بەڵام بۆ ئەوانەی ناتوانن بیخوێننەوە بێ سوودە.

"کارلۆ کۆلدونی"

563. نائومێدی یەکەم هەنگاونانی مرۆڤە بەرەو گۆڕ، چارەڕەشترین کەس ئەوەیە دڵێکی بێ ئومێدی هەبێ.

"بناپارت"

564. هەژاریی و ناحەزبوون، ناشاردرێنەوە.

"مەغریبی"

565. خۆشەویستی و ئەڤین تا ئەو کاتە جێگەی ڕێزە کە بە نووسراو بێ.

"بێرمەیی"

566. لەهەموو قامووس زاراوەکانی مرۆڤدا، هیچ وشەیەکی باشتر، رەوانتر و جوانتر لە وشەی "یەکسانی" نادۆزییەوە.

"؟"

567. مرۆڤی بێ ئیش و بێکار، قسەی زیاتر دەکات.

**"فەرەنسی"**

568. زەماوەندکردن و هاوسەرگیری، بەشێکە لە راستیی ژیان.

**"ئەمریکی"**

569. کات، بەنرخترین شتە لە ژیانی مرۆڤدا، دەتوانی زێڕ پاشکەوت بکەی، بەڵام کات نایەتە پاشکەوتکردن.

**"د.مادرن"**

570. بەگرژی ناتوانی بەسەر رق و تووڕەییدا زاڵ بی، تەنیا خۆشەویستی و بەزەیی شەڕی ناخۆشییەکان دەکا.

**"بودا"**

571. چارەڕەشی، هەمیشە ئەنجامێك بووە لە بیرکردنەوەی چەوت.

**"هیتلێر"**

572. بیر، خەیاڵ، ناڵە، حەز و فرمێسك هەموویان هاوڕێی خۆشەویستی راستەقینەن، ئەگەر بەیەکەوە بێن.

"شکسپیر"

573. خۆشەویستی، واتە سەرگەرمییەك بۆ مرۆڤی بێ ئیش و بێکار!

"ناپلیۆن"

574. ژین و ژیان شتێکی خوداییین و ئەڤینیش خەیاڵاتی ئەو دووانەیە.

"ئاڵفرێد دۆموسە"

575. بێدەنگی لە زانا و نەزان جوانە، چونکە نەزانینی نەزان دادەپۆشێ و زاناش جوانتر بەرچاو دەخات.

"م.حیجازی"

576. ئومێد، تۆوی بەختەوەری و کامەرانییە لە کێڵگەی دڵدا.

"رەبیع ئەنساری"

577. هەوڵ بدە گومانی خراپ نەخەیتە پاڵ خەڵك، چونکە تەنیا بێزاری و ناخۆشییەکەی بە تۆ دەگات.

"سوقرات"

578. ئەگەر هیچ شادییەك بۆ ئێمە نەماوە، باشترین شادیمان ئەوەیە خۆمان شاد و بەکەیف دەربخەین.

**"ویلیام جیمس"**

579. مرۆڤی تێنەگەیشتوو هەمیشە باسی رابردوو دەکا، زانا لەهەوڵی ئێستە دا و شێت هەر خەریکی داهاتوویە.

**"ناپلیۆن"**

580. خۆڕاگری و هێمنی، زیاترین گەورەیی و ڕێزت پێ دەبەخشن.

**"لویی پاستۆر"**

581. دەزانن بۆچی خۆمان زۆر پێ چاژەڕەشە؟ چونکە کەمتر ئاگەمان لە بەختەوەریی خۆمان هەیە.

**"مترلینگ"**

582. پێکەنینێکی ئاسایی و سرووشتی، هاوارێکی بەهێزە لەوەی گیانێکی تەندروستمان هەیە.

**"؟"**

583. زمـان و ئـەدەب، هـۆی سـەرەکیی ژیـان و مانـەوەی هـەر نەتەوەن.

"ڤیکتۆر یۆشە"

584. دڵـی دایـک ، شـاکـاری ئەفراندنی سـەرجەم کارەکانی خودایە.

"هندی"

585. خـەمخواردن بـۆ رابـردوو نیـشانەی شکستە، خـۆت لەگـەڵ ئێستەدا بگونجێنی تا بەرەو سەرکەوتن بڕۆی.

"ئالفردکاپۆ"

586. ترسنۆک بـەر لـە مردنـی، هـەزار جـار دەمـرێ، بـەڵام مرۆڤـی نەترس تەنیا یەکجار و بۆ هەمیشە دەمرێ.

"شکسپیر"

587. خۆشەویستی، زێڕێکی پڕ بایەخە ئەگەر تێکەڵاو بە داوێن پاکی بووبێ.

"تولستۆی"

588. پێکەنین و بزە، باشترین و بەهێزترین کەرەسەی شەڕن لە دژی ناخۆشییەکانی ژیان .

"ئاناتۆل فرانس"

589. فەرامۆشیی، باشترین ڕێگەی ڕزگاربوونە لە خەم و ناخۆشییەکان.

"نیزام وەفا"

590. ترسنۆک، نە شادی دەبینێ و نە خەمباری.

"؟"

591. هەرکەس خاوەن هەوڵ و ئومێد بێ، بەخت باڵی بەسەردا دەکێشێ و بەختەوەریی بۆ بەدیاری دێنێ.

"؟"

592. خۆتان چی بن باشتر ئێوە دەناسێنێ نەك ئەوەی خۆتان چۆن باسی خۆتان بکەن.

"ئیمیرسۆن"

593. هەرکات بڕوا و متمانەی نێوانتان نەما، بزانە شتێك بەناوی خۆشەویستی نەماوە و نامێنێ.

"پوشکین"

594. هەرکات بڕیارت لەسەر ئەنجامدانی کارێك دا، دەرگەی سەرجەم کارەکانی تر ببەستە.

"فردریك"

595. کاتێك قسەیەك دەکەی، شتێك بڵێ کە خۆت بڕوات پێ بێ، ئەگینا کەس لێت وەرناگرێ و بۆی ناسەلمێ.

"؟"

596. ڕاستی و دروستیی هەرکەس، گەورەترین قازانجی بۆ خودی ئەو کەسە دەگەڕێتەوە.

"؟"

597. بڕوا بە پێکەنینی دوژمن مەکە.

"؟"

598. تێگەیشتن لە پرسیار، ئاشکرابوونی نیوەی وڵامەکەیتی.

"؟"

599. گۆڕەوی دەبەرکردن، ڕاست و چەپی ناوێ، زۆر خۆت بە شتی لەو شێوەیە سەرقاڵ مەکە.

"؟"

600. هەرکەس لە گفتوگۆدا دەنگی بەرز کردەوە و ڕێزی نەگرت، خەریکە بەزەبری دەنگ شتێکی ناڕەوا بسەپێنێ.

"؟"

601. بۆ سەلماندنی یەك درۆ، ناچاری چەندان درۆی تریش بکەی.

"؟"

602. قانعترین مرۆڤ، لە هەمووان زیاتر هەست بە هەبوونی دەکا.

"؟"

603. گەورەترین نیعمەت و دیاریی ژیان، ئاسایش و ئارامیی ڕۆحە.

"؟"

604. تا دەتوانی خۆت لە زۆر خەوتن بپارێزە، چونکە لە پاش مەرگدا کاتێکی زۆرت بۆ خەوتن هەیە.

"؟"

605. مۆسیقای باش و گونجاو، تۆزی ماندوویی لەسەر مێشك لادەبات.

"؟"

606. ئەگەر ئەمڕۆ کارێکی چاکەت لەدەست هات بیکە، بەڵکوو سبەی لە دەستت نەهات!

"؟"

607. ناوچاوانی هەرکەسێك، ئاوێنەی دڵیەتی.

"؟"

608. قسەی راست وەك درك وایە، ئێش و ئازاری لەگەڵە.

"؟"

609. لە فەیلەسوفێکیان پرسی: چیت خۆش دەوێ؟ گوتی: ئاگر! چونکە ئاگر زێڕ دەردەخات و زێڕیش پیاو.

"ئێرانی"

610. لاوازترین مرۆڤەکان ئەوانەن کە توانای راگرتنی رێزی خۆیان نییە.

"ئێرانی"

611. شاعیر، راستگۆترین مێژوونووسە.

"؟"

612. هەرگیز ناتوانین پاداشتی تەواوی خودا و دایك و باوك و مامۆستا بدەینەوە.

"؟"

613. سەرجەم ئاڵوگۆڕەکان وەك مێوەن وان کە پێگەیشتنیان پێویستی بە کاتە.

"؟"

614. سەرکەوتن دژوارە و هاتنە خوارەوە ئاسان!

"؟"

615. کاتێ سەگ برسی بوو، تەرازووی ویژدان خوار دەبێ.

"؟"

616. ئەگەر بە گەرمای خۆری بەیانیان گەرم نەبوویتەوە، گەرمای ئێواران گەرمت ناکاتەوە.

"؟"

617. ئەگەر هەزارساڵ باران نەبارێ، دیسان هەر نرخی ئاو لە نان هەرزانترە.

"؟"

618. ئەگەر خۆت نەخەیتە ناو بەفر و سەهۆڵ، پێکانت هەرگیز تووشی سڕبوون نایەن.

"؟"

619. بەسەرهاتەکانی ژیان ناتوانن لە ژیاندا بە چۆکمدا بێنن.

"لیپلینگ"

620. دڵسۆزی، گوڵێکە لە باخچەی هەژاراندا پەیدا دەبێ.

"؟"

621. هەرکەس هەوڵی دابینکردنی ژیانێکی خۆشتر نەدا، منداڵێکە خۆی بەملی کۆمەڵگەوە هەڵواسیوە.

"ڤیکتۆر پوشە"

622. لە شکست مەترسن، چونکە ئەگەر تامی ناکامی نەچێژن، قەدری سەرکەوتن و بەختەوەری نازانن.

"شافنر"

623. دایک، بە دەستێکی لانک رادەژێنێ و بە دەستەکەی تری جیهان دەلاوێنێتەوە.

"ناپلیۆن"

624. ئەگەر باوکم ژیانی پێ بەخشیوم، مامۆستاکەم فێری کردووم چۆن ئەم ژیانە بکەم.

**"ئەسکەندەر مەقدونی"**

625. ئەڤین، شابالێکە خودا بە مرۆڤی بەخشیوە تا بۆ لای خۆی بگێڕێتەوە.

**"مایکل ئانژ"**

626. من و خەڵکی ئەسینا هەمووما نەزانین، من دەزانم کە نەزانین، بەڵام ئەوان زانا نین کە بزانن نەزانن!

**"سوقرات"**

627. حەفتا و دوو ساڵە دەخوێنم و دەنووسم، تازە دەزانم کە هیچ لە هیچ نازانم!

**"سوقرات"**

628. وامزانی وڵات وەزیری ڕووناکبیر و زیرەکی دەوێ، بەڵام ئێستە زانیم تەنیا پاشای دادپەروەری دەوێ.

**"ئەمیر کەبیر"**

629. دەڵێن بەهەشت لەژێر پێی دایکدایە، من دەڵێم هەروەها جەهەننەمیش هەر لەژێر پێی ئەودایە.

"مارك تواين"

630. لە دنیا لە یەك شت بترسێن، ئەویش هەمان ترسە!

"ناپلیۆن"

631. بۆ لەدایکبوون و مردن هیچ چارەیەك نییە، بۆیە لە نێوان ژیان و مەرگدا باشترین سوود وەربگرە.

"جۆرج سانتابان"

632. جوانترین و رازاوەترین چرای ژیان، ترۆپکی هیوایە، هەربۆیە بەشی مرۆڤی بێ هیوا هەر نەمانە.

"شکسپیر"

633. باشترین دەرمان و چارەسەری بۆ دڵی شکاو ئەوەیە جارێکی تر ئەو دڵە بشکێنییەوە!

"ژان ژاك روسۆ"

634. هەلایسانی شـۆڕش زۆر ئاسانە، بەڵام راگرتن و درێژەپێدانی ئەو شۆڕشە ئەستەمە و هونەرە.

**"رۆماریۆ"**

635. زۆر ناخۆشە کە مرۆڤ لە سەرە مەرگدا بێ و تازە بزانێ کە هیچ نازانێ.

**"موریس مترلینگ"**

636. پێکەنین لە مەیدانی ژیاندا، گەورەترین چەکە.

**"ئەناتۆل فرانس"**

637. هەرکەس گوتی من خەیاڵاتی نیم، پێی بڵێن، ئەو قسەیەت یەکەم خەیاڵی تۆیە!

**"فرانس"**

638. ئەگەر بەنیازی منداڵی ژیر و دانات هەبێ، خۆت زانا و رووناکبیر بە.

**"ئالبرێت هۆبارد"**

639. ژیان، تێکەڵێکە لە پێکەنین و گریان.

**"داستایۆفسکی"**

640. لە بەرزترین چیا لـە سێدارەم بـدەن و لـە قـووڵترین دەریـادا بخنکێم، دەزانم کێ بۆم دەگری، تەنیا دایکم.

"پلینگ"

641. گەورەیی لـەوەدا نییـە هـەرگیز نەکـەوین، بگـرە لەوەدایـە کـە ئەگەر کەوتین دیسان هەستینەوە.

"ئاندرە ژید"

642. سـەرجەم خـەڵك كـۆكن لەسـەر ئـەوەی بەختـەوەری پایـەی ژیانێکی خۆشە و هەموویان قسە و بۆچوونی هاوشێوەیان هەیە، بەڵام جیاوازن لەوەی ئاخۆ بە کام ڕێگەدا زووتر بەو بەختەوەرییە دەگەین.

"ئارتو بریزان"

643. زۆرکـەس بـەدوای بەختەوەریـدا دەگـەڕێ، وەك ئـەو کەسـەی کڵاوی لەسەر بێ و لە کڵاوەکەی بگەڕێ.

"فنرلینگ"

644. ژیان لەگەڵ ژنی خەراپدا تەنیا لە ژیانی نـاو کۆڵانـان باشـترە، بەڵام لەگەڵ ژنی چاکدا لەگەڵ دایکوباوك باشترە.

"؟"

645. دار پیر دەبێ و تەنیا یەکجار بازی لەسەر دەنیشێ، ئەی دار ئەو دەرفەتە لە دەست مەدە.

"؟"

646. بەدناو کردنی خەڵك، کاری نامەردانە.

"؟"

647. بازرگان کە مایەپووچ بوو، بەدوای کۆنە کاغەزاندا دەگەڕێ.

"؟"

648. بەرد لە سەرت بدەی یان سەرت لە بەرد بدەی، ئاگەداربە کە هەر سەری تۆیە دەشکێ نە بەردەکە.

"؟"

649. پێم خۆشە لە دۆزەخدا بە سەربەستی بژیم، نەك لە بەهەشتدا بە ژێردەستی.

"؟"

650. زۆر متمانە بە دۆستی نوێ و خانووی نوێ مەکە.

"؟"

651. هاوســەرگیری، کارێکــە ئەگــەر ئــەمڕۆ بیکــەی زووە و ســبەی درانگە.

"؟"

652. هەموو کەس حەز دەکا ماوەیەکی زۆر بژی، بـەڵام بـیّ ئـەوەی تووشی پیری بیّ.

"؟"

653. ئازادی بۆ مرۆڤ نایەتە خوارەوە، پێویستە مرۆڤ خـۆی بـەرەو ئازادی سەربکەویّ.

"؟"

654. بۆ کەسـی دەسـتەوەسـتان و تەمبـەڵ، بـاکوور و باشـوور هـیچ جیاوازییەکی نییە.

"؟"

655. شێر هەر شێرە، چ شێری میّ بیّ چ شێری نێر.

"؟"

656. ئەگەر دەستت کەوتـە بـن بـەردێك، بـەئارامی و زۆر لەسـەرخۆ دەری بێنەوە، نەکا بریندار بیّ و دەریش نەیەتەوە.

"؟"

657. کوێر تا زیندووە هەر بەتەمای چاو دەژی، ئومێدەکەی ڕووناکیی هەمووی ژیانیەتی.

"؟"

658. دەتوانی تاقمێک لە کۆمەڵگە بۆ ماوەیەک فریو بدەی و تاقمێکیش بۆ هەمیشە، بەڵام هیچ هێزێك ناتوانێ سەرجەم کۆمەڵگە بۆ هەمیشە فریو بدا، چونکە هەموو کۆمەڵگەیەک سنوورێکی هەیە لەوەی چەندە فریو بخوا.

"لینکلۆلن"

659. بەرد تا لە شوێنی خۆیدایە و هەڵنەقەنراوە، قورس و گران و سەنگە، بەڵام کە لەو شوێنە جووڵا، لەنگە.

"؟"

660. ڕێبوار هەرچەند زیاتر پشوو و وچان بدا، زیاتر لە کاروانی هەڤاڵانی دوور دەکەوێتەوە.

"؟"

661. پیلانی خراپ دژ بەو کەسە نێزیکەت مەگێڕە کە بە متمانەوە لەلات دانیشتووو.

"؟"

662. هەموو شتێك لەلای باریكییەوە دەپسێ، بەڵام زوڵم و زۆرداری لە ئەستووریدا دەپسێ.

"؟"

663. ئەوانەی لە رێگەی چاندنی نەمامی ئازادیدا گیان دەبەخشن، بەری ئەو دارە ناخۆن.

"؟"

664. ئەگەر جارێك سەرنەكەوتی، رێگە مەدە ئامانجەكەت فەرامۆش بكەی كە پێشتر هەوڵت بۆ دەدا.

"؟"

665. ئەگەر ناتوانی ژمارەی هاورێكانت زیاد بكەی، بەلایەنی كەم دوژمن بۆ خۆت زیاد مەكە.

"؟"

666. كوڕ بە مەلەكردنی باوكی ناپەڕێتەوە، دەبێ خۆی مەلە بزانێ و مل لە دەریا بنێ.

"؟"

667. به‌رهه‌می كار وه‌ك هێلكه‌ وایه‌، تا سپی نه‌كه‌ی ناتوانی بیخۆی.

"؟"

668. مه‌یموون، تا ناشیرینتر و ناحه‌زتر بێ، یاریكردن له‌گه‌ڵیدا خۆشتر و به‌چێژتره‌.

"؟"

669. بێ شه‌رمیی، فێڵێكه‌ مرۆڤی بێ هونه‌ر و نه‌زان له‌ مه‌یدانی ژیاندا بۆ گوزه‌ران به‌كاری ده‌بات.

"؟"

670. نهێنی، ئه‌و شته‌ی خۆمان ناتوانین بیپارێزین و باسی ده‌كه‌ین، به‌ڵام داوا له‌ به‌رامبه‌ركه‌مان ده‌كه‌ین بیپارێزێ.

"؟"

671. ئه‌گه‌ر له‌ پێدانی پاداشتدا ده‌ستت كورته‌، له‌ پێزانین و گوتنی سوپاسدا زمانت درێژ بێ.

"؟"

672. خوێندنه‌وه‌ی چاك، له‌راستیدا لێكدانه‌وه‌ی نووسراوه‌كان و گه‌یشتن به‌مانای دروستی وشه‌كانه‌.

"؟"

673. هەر نووسەرێك بۆ ئەوەی جوان بنووسێ، دەبێ سەرەتا خۆی لە جێگەی خوێنەرەکانیدا بنێ.

"؟"

674. گریان، زۆرجار فێڵێکە مرۆڤی لاواز و ژێردەستە بۆ گەیشتن بە مەبەست و ئاواتێك پەنای بۆ دەبا.

"؟"

675. وتاری باش 3 تایبەتمەندیی هەیە: کورت، روون و پڕ لە راستی، ئەگینا ئەوە چیرۆکە نەك وتار.

**"هاوار بازیان"**

676. خوێندنەوەی بێ بیرکردنەوە لە نووسینەکە، وەك قووتدانی چێشت یان خواردنێك وایە بێ جووتن!

"؟"

677. کاتێك ئێمە لەو ژیانە ناگەین کەوا تێیدا دەژین، چۆن دەتوانین لە شتێکی نادیاری وەك مردن و مەرگ بگەین!

"؟"

678. بەشوێن شتێکدا مەڕۆ کە تەنیا بەچاو دەیبینی، بەڵکوو بەدوای شتێکدا بڕۆ کە بە بیر و هۆش و چاو دەیبینی.

"؟"

679. هەموو دارێك گوڵ دەکا، بەڵام هەموویان بەر و بووم نادەن.

"؟"

680. گۆزەکەر، خۆی لە گۆزەی شکاودا ئاو دەخواتەوە.

"ئێرانی"

681. بێزاربوون ناخۆشترین شت نییە، بەڵکوو ئەوەیە حەز بە گاڵتە و کەیفخۆشی نەکەی، بەڵام ناچارت بکەن.

"؟"

682. دان بەخۆداگرتن و لێبووردەیی، لە هەموو تاڵییەك تاڵترە، بەڵام بەرهەمیان لە هەموو شیرینییەك شیرینترە.

"؟"

683. حەز و ئارەزوو، تاکە شتن مرۆڤی نەدار و هەژار هەموو ڕۆژێك دەیخۆن.

"؟"

684. تەلەفۆن، ئەو بەستەزمانەی دەبێتە هۆی زمان درێژی و زۆربلەییی هەندێك کەس.

"؟"

685. دەروونناسی، هونەرێکە هەموو پێیان راست و باشە، بەلاّم لە تایبەتمەندییەکانی رادەکەن.

"؟"

686. سەبر و دان بەخۆداگرتن، ئامێری گواستنەیە کە بەهێمنی بەرەو ئامانج دەڕوا، بەلاّم هەر دەگاتە مەبەست.

"؟"

687. شانس و بەخت، ئەو 2 شتەی پیاوی سەرکەوتوو هەرگیز بڕوایان پیّ ناکا و بایەخیان پیّ نادا.

"؟"

688. ناوبانگ، شتێکە دەبیّ وەدەستی بێنی، بەلاّم رێز و حورمەت شتێکە نابیّ لە دەستی بدەی.

"ئارتۆر شوپنهاور"

689. کەسایەتیی راستەقینەی تاکێکی کۆمەڵ، هەمان ئەو قسانەن کە خەڵك پاشەملە لەبارەیەوە دەیکەن.

**"ئیدو هاو"**

690. مەڕوانە کێ قسە دەکا، بزانە ئەو قسانەی دەکرێن چین.

**"ئوکتافیو پاز"**

691. چرات لە دەستی هەرکەسێکدا بینی، رێزی لێ بگرە و سڵاوی لێ بکە.

**"ئوکتافیو پاز"**

692. ئەو کەسەی ئاشقی خۆیەتی و بەخۆی دەنازێ، لایەنیکەم شانسی هەیە کە رکابەری کەمن!

**"جۆرج کریستۆفەر"**

693. هەمووکەس کاری باش دەکا، بەڵام تەنیا لەوانە دیارە کە ئەرکیان چاکە بووە و هەر لەوان دیارە.

**"رۆبرت بنچلی"**

694. پێویست ناکا دوژمنانتان خۆش بوێ، لەگەڵ دۆستانتان رەفتارێکی باشترتان هەبێ.

**"ئید هاو"**

695. بەرلە پاڕانەوە بۆ بارینی باران، ئاگەداری پێشبینیی کەشناسی بن، بەڵکوو بیّ پاڕانەوە خۆی باری.

**"مارك تواين"**

696. ئێمە هەمیشە خەریکین خۆمان بۆ ژیان ئامادە دەکەین، هەر بۆیە فریا ناکەوین بژین.

**"ئیمرسۆن"**

697. بە میلیۆنان مرۆڤ خوازیاری ئەوەن هەرگیز نەمرن، بەلاّم ئەگەر دوا نیوەڕۆی ڕۆژێکی پشوو باران بباریّ، نازانن چۆن کاتی خۆیان بەسەر ببەن و لە هەموو ژیان و دنیا بێزار دەبن، ئەوەیە حەزەکانی مرۆڤ.

**"سۆزان ئەرتز"**

698. نرخی مرۆڤ لەو شتەدا نییە وەدەستی هێناوە، بگرە لەو شتەدایە کە حەز دەکا وەدەستی بێنیّ.

**"جبران خليل"**

699. بەر لەوەی فەرمانی ڕۆیشتن بەخۆت بدەی، تەواو دڵنیا بە لەوەی دەتوانی بگەڕێیتەوە.

**"روجر ئەلسين"**

700. ئەگەر هەموو بەکراوەیی باسی بیروڕای خۆیان بکەن، هیچ کێشەیەك بۆ گفتوگۆ لەئارادا نابێ.

"بنیامین دسریلی"

701. کەسی زانا، بەپێی پێویست شت دەکڕێ، نەك بەپێی توانا، خۆ ناکرێ هەرچی بۆت کرا بیکڕی.

"میشل دومونتان"

702. مرۆڤ تاکە ئاژەڵێکە دەتوانێ هەڵسوکەوتی دۆستانە لەگەڵ ئەو زیندەوەرانەدا بکا کە بەنیازە بیانخوا.

"باتلەر"

703. ڕۆژنامەنووسی ڕاستەقینە وەك پزیشکی دڵسۆز وایە، ڕاستییە تاڵەکان وەك دەرمان دەرخواردی خوێنەر دەدا تا لە نەخۆشیی خەو ڕاپەڕێ و هۆشیاری بکاتەوە.

"د.احمد"

704. هەرکات ڕێگەی ئەقڵ و زانست گیرا، شێتی سەر هەڵدەدات.

"ئوکتافیو پاز"

705. کاتێك مرۆڤ بەهۆی بیروڕاکانی ژیانی ئاسایی لێ تێك چوو، دیارە شتێك بەناوی ئازادی نییە.

"بیرتراند راسیل"

706. مرۆڤی تاوانبار بۆ دڵدانەوەی خۆی بەرامبەر کار نامرۆڤەکانی دەڵێ: هەرچی بێ منیش مرۆڤم.

"هاریس"

707. ترس و چاوەڕوانی، 2 پاسەوانی دۆزەخیین کە لە دنیادا هۆی هەموو ئازارەکانی مرۆڤن.

"گاندی"

708. سەرچاوەی سەرەکیی هەموو پاشکەوتن، کۆنەپەرستی و زۆرداریيەك ترسە، زاڵبوون بەسەر ترسدا سەرەتایەکی گرینگە بۆ زانایی و تێگەیشن و زاڵبوون بەسەر هەموو شتەکانی تردا.

"بیرتراند راسیل"

709. قارەمان ئەو کەسەیە بتوانێ ترس بکاتە هێزێکی سوودمەند و بیخاتە خزمەت ئامانجەکەی.

"د.ئیس نیل"

710. هۆی بەدەست هێنانی ماڵ و سامانی گەورەی دەوڵەمەندێك، سەرەتا ترسی لە دەستدانی ئەو بڕە کەمە بووە کە پێشتر بەدەستی هێناوە و پارێزگاری لێ کردووە، تا ئەوەی زیادی کرد و ئێستە بووە دارایی و سامانێکی زۆر.

"ئانتونی"

711. زانست لە هەموو کارێکدا قسەی یەکەم دەکا، بەڵام مەرج نییە هەمیشە دوا قسە لای زانست بێ.

"ڤیکتۆر هۆگۆ"

712. سەرجەم زانستەکانی ئێمە لە ئاست راستییەکاندا سەرەتایی و منداڵانەن، بەو حاڵەش زانست بەنرخترین شتە کە ئێمە دەتوانین بڵێین بو ژیانی ئەمڕۆکەی مرۆڤایەتی هەمانە.

"ئینشتاین"

713. زانست بەبێ ویژدان، بکوژی رۆحە.

"فرانس بیکن"

714. دادپەروەری بیرۆکەیە و رێبازێکە، بەڵام زۆرداری شتێکە هەیە و هەستی پێ دەکرێ.

"لیندا بلاندفۆرد"

715. کۆمەڵگە بەرهەمهێنی تاوانە، تاوانبار تەنیا کەسێکە و جێبەجێی دەکا.

**"کوتوله"**

716. کات مامۆستایەکی مەزنە، بەڵام بەداخەوە دواجار سەرجەم قوتابییانی دەکوژێ.

**"هیکتور بیرلیوز"**

717. ئەوەی بەپارێزەوە باسی راستییەکان دەکا، نیوەی راستییەکانی شاردووەتەوە.

**"جبران خەلیل جبران"**

718. کینە و رق ناتوانن شەڕی رق و کینە بکەن، بەڵام خۆشەویستی توانی ئەو کارەی هەیە.

**"د.مارتینگ لوثر کینگ"**

719. کۆنەپەرەستی، درۆ و ناڕاستی پاداشتی گەورەیان پێ دەدرێ، بەڵام راستی ناچارە سواڵ بکا.

**"د.مارتینگ"**

720. هیچ وتەیەك بەئاسانی مەسەلمێنین بەو بیانووەی خاوەن وتەکە پێشتر قسەی چاکی کردوون!

"رایش باح"

721. تەنیا یەك شتی باش هەیە ئەویش زاناییە، هەروەها تەنیا شتێکی خراپ هەیە کە نەزانییە.

"سوقرات"

722. رەخنەگر، ئەو کەسەی هونەری بینین فێری ئەوانی تر دەکا.

"بریمت"

723. ئەگەر هونەر نەبووایە، راستییەکان وێرانیان دەکردین.

"نیچە"

724. ئەڤین، پردێکی زێرینە پێیدا دڵ بەرەو ئاسمان سەردەکەوێ.

"ئیمانوئێل گایل"

725. تا ئاسمان تاریکتر بێ، ئەستێرەکان جوانتر و زیاتر دەدرەوشێنەوە.

"لیئوناردۆ داڤینچی"

726. تەنانەت لەو بەردانەی سەر ڕێگەیان گرتووی، دەتوانی شتی زۆر جوان دروست بکەی.

"گوتە"

727. هەرکات هیوا بە ژیان نەما، مردن دەست پێ دەکا.

"ناپلیۆن"

728. ڕاستییەکی تاڵ، هەزاران درۆی شیرین دێنێ.

"ئەفریقایی"

729. بۆ زاڵبوون بەسەر چارەنووسدا، هیچ کات درانگ نییە.

"ماریا هیربێرت"

730. سادەترین ڕاستییەکان ئەوانەن کە هەمیشە درانگتر لە هەمووان بۆ مرۆڤ دەردەکەون.

"لودویك فویرباخ"

731. ئەوەی دەیزانین دڵۆپێکە و ئەوەی نایزانین ئۆقیانووسێك.

"نیوتون"

732. ئەوانەی دژی ئازادین، کەسانێکن کە خۆیان شایانی ئازادی نین.

**"ئابراهام لینکۆڵن"**

733. تا قەفەس تەنگتر بێ، ئازادی شیرینتر و بەتامترە.

**"ئاڵمانی"**

734. ڕۆژێك ژیان بە ئازادی لە 40 ساڵ ژیان بە ژێردەستەیی و دیلی باشترە.

**"بابەك خوررەمدین"**

735. هەرگیز هەوڵ مەدە کەسێك وەك خۆت لێ بکەی، چونکە سرووشت هەرکەسی بۆ خۆی ساز کردووە.

**"ئیمرسۆن"**

736. شەڕ، سەرجەم گۆشەکانی تاریکی مرۆڤ ڕووناك دەکاتەوە و مرۆڤ خۆی و تواناکانی دەدۆزێتەوە.

**"ئۆریانا"**

737. میوان هەمیشە خۆشحاڵت دەکا، ئەگەر بەهاتنی خۆشحاڵ نەبی، بەڕۆیشتنی خۆشحاڵ دەبی.

**"فرانسوا روشفوکوا"**

738. سێکس کاتێکی کەم دەبا و خۆشییەکەی زوو تەواو دەبێ، بەڵام کێشە و گێچەڵێکی زۆری پێوەیە.

**"جان بریمور"**

739. دلداری، یانی ناسینی پیاو و ژنێك کە یەکتر ناناسن!

**"سامریست موام"**

740. ئیمپراتۆرییەکان لەناو دەچن، بەڵام شیعرێکی باش و جوان هەرگیز لەناو ناچێ.

**"هیموت"**

741. بەختەوەر، کەسێکە شادبوونی خەڵك بە شادیی خۆی بزانێ.

**"گوتە"**

742. لەجیاتی ناردنی نەفرەت بۆ تاریکی، مۆمێك بۆ رووناکیی داگیرسێنە.

**"کۆنفسیوس"**

743. ئەوەی لای ئێمە بە مەرگ ناسراوە، جۆرێکە لە ژیان کە نەمانتوانیوە لە جۆرەکەی تێ بگەین.

"مرلینگ"

744. مرۆڤ لە هەر تەمەنێکدا لە کارکردن وەستا، وا باشترەساڵی دواتر بمرێ.

"ئێدیسۆن"

745. زۆرن ئەوانەی تەنیا بەدەنگی پاچ و خاکەناسی گۆڕهەڵکەن لەکاتی مردنی کەسێکدا لەخەو هەڵدەستن.

"ناپلیۆن"

746. هەرکەس لە مەرگ بترسێ، ئەوە لە ژیانیش هەم دەترسێ.

"ڤۆلتێر"

747. شوێنی نووستن، مەترسیدارترین جێگەی جیهانە، چونکە زۆربەمان لەو شوێنەدا گیان دەسپێرین.

"مارك تواین"

748. مردن و مەرگ، زۆر ئاسانترە لە بیرکردنەوە لەبارەی خودی مەرگەوە.

"بزورگ عەلەوی"

749. ژیان زۆر شیرینە، چونکە مرۆڤ تێیدا یەکجار و بۆ هەمیشە دەمرێ.

"مولیر"

750. لە کاتی مردن و ناشتنی مندا، هەردوو دەستەکانم لە تابووتەکە دەربێنن تا سەرجەم خەڵکی دنیا بزانن کە لەم هەمووە گەنجینەی دنیا و سامانەی هەمە، لە دنیا هیچم لەگەڵ خۆمدا بۆ نەچووە.

"ئەسکەندەر"

751. ژیان، ڕێپێوانێکە بەرەو بارەگەی مەرگ تا بەیەکجاری و بۆ هەمیشە بژین.

"نیکول"

752. زیندووەکان، ئەو مردووانەن کە بۆ پشوودانێکی کوورت لە دنیادا سەیران دەکەن و پشوو دەدەن!

"مترلینگ"

753. ژیان بۆ مرۆڤەکان نەخۆشییەکی دەردناکە، کە تەنیا بە مەرگ چارەسەر دەکرێ.

"ئەبو عەلا"

754. ئەی مەرگ، سوپاست دەکەین کە رووناکی دەخەیتە سەر ئەو هەمووە نەزانینانەی ئێمە.

**"بوسەئە"**

755. بۆ ژیانکردن راشکاو و بوێر بە، چونکە مەرگ هەر هەیە و لێمان وەرناگرنەوە.

**"محەمەد مەسعوود"**

756. زۆرن ئەوانەی پێش مردن نفرەت دەکرێن و دوای مردنیان خۆشەویست دەبن.

**"سیرون"**

757. هەندێك خەڵك لەترسی مردن، خۆ بەکوشت دەدەن!

**"ئەسەد ئابادی"**

758. وەرن با ژیانمان وەك گوڵەکانی هاوین و مەرگمان وەك گەڵاکانی پاییز بە خەسار نەچێ.

**"تاگور"**

759. ئەوەی خۆ دەکوژێ حەز دەکا خۆشەویستتر بێ، بەڵام نازانێ بۆ خۆشەویستی رێگەی باشتر هەیە.

**"م.حجازی"**

760. ئەگەر مردن نەبووایە، هەرگیز رەفتار و هەڵسوکەوتی باش پێك نەدەهات.

**" شاتو بریان"**

761. ئەگەر بزانن تاوانبارێك لەپای سێدارە چەندە ئارەزووی گەڕانەوە بۆ ژیان و دەستپێکردنی ژیانێکی پاك و دوور لە خراپەی هەیە، ئەوکات زۆر زیاتر لە ئێستە قەدری یەکتریتان دەزانی و بە پاکی لە یەکتریتان دەڕوانی.

**"سینا"**

762. ژیان خەوە، مەرگ هەستانە لەم خەوە، گازندەی کورتبوونی دەکەین، هەوڵیش دەدەین کورتتر بێتەوە.

**"دیکارت"**

763. لەدایك بووم و نەمزانی بۆچی؟ ژیانم کرد و نەمزانی چۆن؟ ئێستەکەش دەمرم و نازانم بۆچی؟

**"باسکاڵ"**

764. مردن، نابوودبوون نییە، بگرە گۆڕینەوەی هاوڕێکانمانە.

**"لامارتین"**

765. مردن، هیچ کات دژوارتر و مەترسیدارتر لە کاتی لەدایکبوونت نییە.

**"ئەناتول فرانس"**

766. مردن، ئارەزووی هەندێکان و مایەی رزگاربوونی هەندێکی ترە، بەڵام دوا چارەنووسی هەموومانە.

**"سنكا"**

767. نەکات ئەگەر تووشی گرفتێك بووی، ئارەزووی مەرگ بکەی.

**"محەمەد د.خ"**

768. زۆرجار مرۆڤەکان بۆ دەربازبوون لە مەرگ، گیانی خۆیان دۆڕاندووە.

**"تبلێر"**

769. هەرکات هەستت کرد ئیتر پێویستیت بەپێشکەوتن نییە، خەریکی ئامادەکردنی تابووتی مەرگت بە!

**"د.ماردن"**

770. مردن ئەستەم نییە، بەختەوەر نەبوون لە هەموو شتێك زەحمەت و ناخۆشترە.

**"هۆگۆ"**

771. هەمووکەس 2 جار دەمرێ، جارێك کە خۆشەویستیی لە دڵ دەرچوو و کاتێك کە بە یەکجاری دەمرێ.

"ڤۆڵتێر"

772. بێکاری و کارنەکردن لە هەموو شتێك زیاتر لە مەرگ و نەمان نێزیکمان دەکاتەوە.

"زانایەکی پۆلۆنی"

773. مەرگی ژیان و جەستە لە بەرامبەر مەرگی ئەڤین یان خۆشەویستێکدا، زۆر کەم بایەخە و هیچە.

" ڤۆڵتێر"

774. بەبێ مەرگ، ژیان هیچ بایەخێکی نەدەبوو، ئەوە ترس لە مردنە کە ژیان بۆ ئێمە خۆش و بەتام دەکا.

"مترلینگ"

775. هەموو شتێك ڕێگەچارەیەکی بۆ دەربازبوون هەیە، جگە لە مەرگ.

"دێهخودا"

776. مەرگ، تاکە شتێکە لەو دنیایەدا زۆر دادوەرانە و بە یەکسانی دابەشی سەر هەمووان کراوە.

"فیلیپ"

777. ئەو بەردەی دڵی لە شێوەی تاشینی پەیکەرسازەکەی برەنجێ، پەیکەرێکی جوانی لێ نایەتە بەرهەم.

**"هیندی"**

778. هەموو ئافرەتێك مرۆڤە، بەڵام هەموو مرۆڤێك ئافرەت نییە، هەر شتێك بەشێکە لە شتێکی تر.

**"هاوار بازیان"**

779. کاتێك جوان هەست بە کورتی و کاتیبوونی ژیان دەکەین کە بیر لە رۆژانی رابردوومان بکەینەوە.

**"هاوار بازیان"**

780. زەوی کە دڵی لە نووکی گاسن بڕەنجی و لە گاجووت بترسێ، بەرهەمێکی باش و بەپیتی نابێ.

**"هندی"**

781. هەموو مەلەوانێك دەتوانێ لە رێڕەوی ئاودا و بێ بوونی گرفت مەلە بکا، بەڵام مەلەوانی چاك کەسێکە بە بوێری و لەخۆ بردووییەوە لە پێچەوانەی رێڕەوی ئاوەکەدا مەلە بکا.

**"بێهرەنگی"**

782. مردن، چرکەیەکە و ژیان تەمەنێك، کەواتە بەخۆشی بژی و لە ترسی مردن، ژیان بەفیڕۆ مەدە. **"هاوار بازیان"**

783. هەمووکەست خۆش بوێ، بەڵام هیچ کەست لەخۆت خۆشتر نەوێ، چونکە ئەوەیان مرۆڤدۆستی نییە.

**"هاوار بازیان"**

784. هەرکەس بڕوای بەئاڵوگۆڕ نەبێ و خۆی لەگەڵدا ڕێك نەخا، هەرگیز پێشکەوتن بەخۆیەوە نابینێ.

**"هاوار بازیان"**

785. هەوڵ نەدان بۆ پێشکەوتن، خۆی دواکەوتووییەکی راستەقینەیە.

**"هاوار بازیان"**

786. تۆمەت و بوختان، وەك خەڵووزی رەش و پیس وایە، ئەگەریش نەتسووتێنێ، رەشت دەکا.

**"رووسی"**

787. بۆ دۆزینەوەی هەڵەکانی خۆتان، رێگە بدەن کەسانی تر قسەتان لەوبارەوە بکەن.

**"ماروین ئشتون"**

788. تاوانبـاران بەدەسـتی یاسـا لـەناو ناچـن، بـەڵکوو بەدەسـت مرۆڤەکانی ترەوە نابوود دەکرێن.

**"جۆرج برنانتشۆ"**

789. کاری هەندێك باش، باشترە لە قسەی زۆر زۆر باش!

**"گوین هیمۆر"**

790. چاکە دەرهەق بە چاکە، کـاری هـەموو کەسـێکە، بـەڵام چـاکە دەرهەق بە خراپە تەنیا کاری جوامێرانە.

**"تورکی"**

791. کاتێك زمانمان کراوەیە، ناکرێ دەرگەی دڵمان دابخەین.

**"بریگهام یانگ"**

792. لە تاوان و جینایەتدا، کاتێـك هـیچ گەواهیـدەر و شـایەتێك بـۆ سەلـماندنی بەڵگەی تـاوان نییـە، شـوێن پەنجـەکان دەریدەخـەن کـە خودایەك هەیە و بەرگری لە راستییەکان دەکا.

**"نیۆتۆن"**

793. مرۆڤـە خـەواڵوو و خەوخۆشـەکان، بەشـێکن لـە سـەرکەوتنی خەڵکانی تر و خۆیان سەرکەوتوو نابن.

**"ئەلبانی"**

794. تاقمـە گـرینگ و زاناکـانی نـاو کۆمـەڵ زۆر ئاسـانتر لـە تاقمـە نەزانەکان، بڕوا بە درۆ گەورەکان دەکەن.

**"هیتلێر"**

795. درۆ هەرچەندە گەورەتر بێ، خەڵك ئاسانتر بڕوای پێ دەکەن.

**"جۆزف گوبلز"**

796. بۆن و مەرامی ئەو گوڵە سوورەی بەهار بۆ هەمیشە لەناو ئەو دەستەدا دەمێنێتەوە کە پێشکێشی بەرامبەرەکەی دەکا، جگە لەوەی دیمەنی کاتی پێدانی ئەو دیارییە هەرگیز لەیاد ناچێ.

**"هێدا بجار"**

797. ئەسپی یەکەمی کێبەرکێی راکردن، ناتوانێ باری قورس هەڵبگرێ، کاری ئەو راکردنە نە بارەبەری.

**"سکاتلەندی"**

798. ئەگەر نیازی ژیانت هەبێ، رێگەیەك بەرامبەرت دەبێتەوە، با لە پشت سەرتە و تیشکی خۆر روومەتت گەرم دەکا، باران کێڵگەی دڵت ئاو دەدا و لێرەدایە هەست دەکەی تامی راستەقینەی ژیان چییە.

**"ئیرلەندی"**

799. هەرکارێك شایانی ئەنجامدان بوو، دیارە شایانی ئەوەیشە بەباشی بێتە ئەنجامدان.

**"فلیپ ئستن هێرپ"**

800. دۆزەخـــی راســـتەقینە، بـــۆ ویژدانێکـــە بـــەردەوام بینـــەری نادادپەروەری و زۆردارییە و خەمی پێوە دەخوا.

"ئەڵمانی"

801. هەرگیز نابێ کارێك ئەنجام بدەم کـە ئەگـەر لـە دوا سـاتەکانی ژیاندا بووام، خۆم لێ پاراستبووایە.

"جاناتان ئدوارد"

802. هونـــەری ژیـــان ئەوەیـــە، راســـتگۆیی و پـــاکیی دەســـتەکانت بەهەموو خەڵك پێشان بدەی و نەترسی.

"ئی ودی لوکاس"

803. زۆربەی ئەوانەی دەوڵەمەندن و سامانێکی زۆریان هەیە، ئەگەر کەســایەتی و ســامانیان مەترســی لەســەر نــەبێ، ئامــادەن واز لــە کۆکردنەوەی زیاتری سامان و دارایی بێنن و قانعن بەژیانی ئێستەیان.

"ماکیاوێللی"

804. هەرگیز ناتوانی دەستی کەسێك بە گەرمی بکوشی، لە کاتێکدا هێشتا دەستەکانت مستی موشت کراون.

"گاندی"

805. بزانە کە هیچ دەستێك لە ژیاندا، باشتر لە دەستەکانی خۆت یاوەری و پشتگیریت لێ ناکەن.

**"فرێد هێنر"**

806. چ نهێنییەك لەوەدایە هەندێکجار دەستی نەیاری خۆمان بەوپەڕی گەرمییەوە دەکوشین؟

**"ئەلکساندر پنی"**

807. مرۆڤی بێ هیوا هاوار دەکا کە ئەی مەرگ بگەیە، ژیان کوشتمی.

**"هاوار بازیان"**

808. هەرکەس لای خۆی ڕێزی نەما و شتە پیرۆزەکانی لا بێ بایەخ بوون، بەهیچ جۆر ناتوانێ کارێك بکا کەسانی تر ڕێزی لێ بگرن، بۆیە بێ ئەوەی خۆی هەست بکا نێوەنێوە کەسایەتییەکەی لەدەست دەدا.

**"هاوار بازیان"**

809. سەربازی ڕاستەقینە، لە شەڕدا بە دیل ناگیرێ، گیانی دەدا، بەڵام خۆی بەدەستەوە نادا.

**"هاوار بازیان"**

810. ئـەو کەسـەی شـتی بەڵگـەدار نەسەلـمێنێ، پێـشوازی لـە سەلماندنی شتە بێ بەڵگەکان دەکا.

"هاوار بازیان"

811. مرۆڤی لەخۆبایی و لووت بەرز کە هـەنگاوی نـا، بزانـێ بەسـەر دەستکردی پینەچییەکدا هەنگاو دەنێ.

"شکسپیر"

812. گوناهکار، بە دەم بەستراوی و بێدەنگی خۆی ون دەکـا، بۆیـە بێدەنگ بێ باشە.

"شکسپیر"

813. کەسێك کە لەگەڵ دەروونی خۆی لە شـەڕدایە، نـاتوانێ باسـی خۆشەویستی بۆ کەسانی تر بکا.

"شکسپیر"

814. چاوەکان هەرچەندە گەورە بن، ناتوانن خۆیان ببینن.

"شکسپیر"

815. مرۆڤـەکان، بـەپێی ویـست و خواسـتی خۆیـان پرسـەکان شـی دەکەنەوە و بەلای خۆیاندا دەیشکێننەوە.

"شکسپیر"

816. ئەوانـەی بـەنیازن ئـاگرێکی گـەورە بکەنـەوە، سـەرەتا بـە سووتاندنی گەڵا بچووکەکان دەست پێدەکەن.

"شکسپیر"

817. شەرەف و مەترسی، دوو هاوڕێی هەمیشەیی و لە یەک هەڵنەبڕاوی یەکترین.

"شکسپیر"

818. مرۆڤی نەزان کوێرکوێرانە پێشوازییەکی وا گەرموگوڕ لە زوڵم و زۆرداری دەکات کە مرۆڤی زانا بە زانستی خۆیەوە ئەمجۆرە پێشوازییە لە دادپەروەری و یەکسانی ناکات.

"شکسپیر"

819. راوێژ لەگەڵ کەسێکدا مەکە کە بڕوای بەکارێك نییە ئەگەر لە سەرەتاوە خۆی دەستی پێ نەکردبێ.

"شکسپیر"

820. هەرکەس هزر و مێشکی خۆی بە دوژمن نەدا، دەبێ ئاگەداری جەستە و گیانی خۆی بێ.

"شکسپیر"

821. مرۆڤی زانا رێگە نادا لە کارەکانیدا رەنگ و روخساری نوێنەرایەتیی ویست و مەبەستەکانی بکا.

"شکسپیر"

822. هەژاران و نەداران، بە بێدەنگی دەمرن و کەس هەستیان پێ ناکا.

"شکسپیر"

823. هەر شتێك لە شتێکی تر بچێ، هەرگیز ناتوانێ تەواو خودی ئەو شتە بێ، تەنیا هاوشێوەیەکە.

"شکسپیر"

824. مرۆڤی ژیر و زانا، رق و تووڕەییەکەی نەرم دەبێتەوە، بەلام مەبەست و بڕیارەکەی ناگۆڕێ.

"شکسپیر"

825. هەرکەس توانی بەپاڕانەوە خەڵك ڕازی بکا، خۆیشی هەم بەپاڕانەوە لێی بۆ هەموو شتێك ڕازی دەبێ.

"شکسپیر"

826. هەرکەس تا خۆی شایانی ڕێز نەبێ و ڕێزی لێ نەگیرێ، قسەکانی جێگەی بڕوا نین و لێی وەرناگیرێ.

"شکسپیر"

827. ئەگەر فرمێسکتان لە چاودا هەیە، ئەویش هەر بخەنە خزمەت سازکردنی ژیانێکی خۆشتر.

"هاوار بازیان"

828. نهێنییەکان بەباشترین شێوە ئاشکرا بکەن، چونکە دەتوانن سوودی باش لە نهێنییەکان وەربگرن.

"شکسپیر"

829. ئەو کەسەی بەرامبەر هاوڕێ و نێزیکەکانی خراپە دەکا، بەرامبەر دوژمنانی هیچی پێ ناکرێ.

"شکسپیر"

830. هیچ کەس و هیچ شتێك هێندە تاقی مەکەوە کە لەژێر تاقیکردنەوەکانی تۆدا بێزار بێ و لەناو بچێ.

"شکسپیر"

831. کارێك مەکە ناچار بی کارێکی تری بۆ بکەی و لە کاری دووەمدا تووشی پەشیمانی بی.

"شکسپیر"

832. هاوڕێکەت خۆش بوێ، بەڵام کەموکوڕییەکانی بە کەموکوڕی وەر بگرە، نەکا هاوڕێتی چاوت بپۆشێ.

**"شکسپیر"**

833. کارێکی وا بکە دوژمنەکەت لە ڕاونان و بەدواچوونتدا ماندوو بێ و خەرجییەکی زۆرت لێ بکا.

**"شکسپیر"**

834. بەڵگەی باش، دەبێ ملکەچی بەڵگەی باشتر بێ و خۆی بەدەستەوە بدا.

**"شکسپیر"**

835. ژیان بریتییە لە هات و نەهات، مرۆڤی زانا لە هاتەکانی باشترین کەڵك وەردەگرێ و لەخۆبایی نابێ، هاوکات لە نەهاتەکانیدا خۆی نادۆڕێنێ و بەسەر خۆیدا زاڵ دەبێ.

**"هاوار بازیان"**

836. تەنیا ئەوکەسەی خۆشترین ساتەکانی بۆ دروست کردی دەتوانێ ناخۆشترین ساتەکانیشت ساز بکا.

**"هاوار بازیان"**

837. ئەگەر هەموومان گوێ لە یەكتری بگرین، كەس كینەی كەسی لەدڵدا نامێنێ تا ناخۆشی بەدوادا بێ.

"هاوار بازیان"

838. ئەوانەی باشیی ئافرەت لە جوانییەكەیدا دەبیننەوە، بێ گومان باشیی پیاویش لە سامانەكەیدا دەبینن.

"؟"

839. بۆ گەیشتن بە شتی گەورە، پێویستە واز لە شتە بچووكەكان بێنین و چاوپۆشییان لێ بكەین.

"هاوار بازیان"

840. ترس، شتێك نییە جگە لە خۆبواردن لە راستییەكان، واتە ترس، هەمان ترسە لە راستییەكان.

"هاوار بازیان"

841. ئەو هێزەی بۆ راكردن لە راستییەكان بەكاری دەبەی، نیوەی سەرفی سەلماندنی خودی راستییەكان بكەی باشترە،
چونكە ناكرێ بۆ هەمشیە لە راستییەكان رابكەی، بەلام دەكرێ تەنیا بۆ جارێك راستییەكان بسەلمێنی.

"هاوار بازیان"

842. هیچ نەبی باشترە لەوەی خەراپ بی.

"هاوار بازیان"

843. کەسێك کە باش دەزانێ کار بە کوتك و چەکوش بکا، پێیوایە هەموو کەس بزمارە.

"ئابراهام نزلو"

844. هیچ کات نابێ گرینگترین کارەکان بەقوربانی کارە کەم بایەخەکان بکەین.

"گوتە"

845. بە یەك پێ هەڵگوتنی سادە دەتوانم 2 مانگ بەباشی بژیم!

"مارك تواین"

846. کە هەستت کرد کارەکانت زۆر گرینگن، بزانە مەترسیی لەخۆ دابڕان و بە هەڵەچوونت تێدا زۆرە.

"برتراند راسل"

847. لە گەورەیی مەترسێ، چونکە پیاوانێك هەر بەگەورەیی لەدایك دەبن، پیاوانێك گەورەیی بەچەنگ دێنن و کەسانێك گەورەییان بەزۆر بەسەردا دێتە سەپاندن، واتە هەموو گەورەییەکان جێگەی لێ وردبوونەوەیان هەیە.

"شکسپیر"

848. کاتی ڕێزگرتن لە خەڵك زۆر خۆت بچووك مەكەوە، چونكە هێندە گەورە و بەڕێز نیت!

"گلدامیر"

849. خۆت خۆش بوێ كە سەرەتای خۆشەویستییەكی درێژخایەن و تامەتاییە.

"ئۆسكار وایڵد"

850. تەنیا بەهۆی گرفتە ئابوورییەكانەوەیە خەڵك پێیان وایە دەوڵەمەندی لە هەژاری باشترە.

"وودی ئاڵن"

851. هیچ شتێك لەم دیمەنە جوانتر نییە، مرۆڤێك بەدڵی پڕ لە خەمەوە زەردەخەنەیەكی لەسەر لێوان بێ.

"هاوار بازیان"

852. ناخۆشترین ساتی ژیان، كاتێك دڵ حەزی لە گریانی بەكوڵە، بەڵام چاوەكان فرمێسكت پێ نادەن.

"د. شەریعەتی"

853. مرۆڤی لەخۆبایی، زۆرجار بێ ئەوەی ئاگەدار بێ، بڕوای بەوە نامێنێ ژیان چەندە كوورت و كاتییە.

"هاوار بازیان"

854. هەموو کەس چاکەکردنی پێ خۆشە، بەڵام هەندێك خوازیارن سەرەتا خۆیان چاکە بکەن پاشان وەڵامیان بەچاکە بدرێتەوە و هەندێك چاوەڕێن چاکەیان دەرهەق بکرێ و پاشان خۆیان جوابی بە چاکە بدەنەوە، ئەوە بەجیاوازیی گرینگی نێوان مرۆڤەکان دادەنرێ لەم بوارەدا، ئەگینا سەرجەم مرۆڤەکان بەجۆرێك حەزیان لە باشبوون و چاکەیە.

**"هاوار بازیان"**

855. ویستی راستەقینە دەبێتە هۆی دەرکردنی بڕیارێکی راستەقینە کە دەبێ ئەنجام بدرێ و بە ئەنجام بگا.

**"رۆبینس"**

856. بەرامبەرەکەت جۆرێك نەرم بکەوە کە لە ئاستی داخوازییەکانی کەم بکاتەوە.

**"هاوار بازیان"**

857. بەها و بایەخەکانی ژیانتان بگۆڕن تا بەو پێیە ژیانتان گۆڕانی بەسەردا بێ.

**"رۆبینس"**

858. شۆڕشی سیاسی، جۆرە نەخۆشییەکە زوو یان درانگ پێویستی بە پزیشکی دەرەکی هەیە.

"؟"

859. هەرکات لە بڕیاردان تووشی گرفت هاتن، بزانن هێشتا بایەخەکانی ژیانتان بۆ روون نەبووەتەوە.

"رۆبینس"

860. یەکەم هەنگاو بو پێکهێنانی گۆڕانکاری، دەبێ بزانین بەڕاستی چیمان دەوێ و ئامانجێک هەڵبگرین، پاشان لەڕووی زانیارییەوە هەنگاوی بۆ بنێین و خۆمان پڕچەک بکەین.

"رۆبینس"

861. تەنیا برسێتی و شکست دەتوانێ مرۆڤی نەزان هان بدا بیر لە خۆی و دەوروبەری بکاتەوە.

"هاوار بازیان"

862. تەنانەت شتە سەلمێنراوەکانیش هەم، ئەگەر خۆمان بمانەوێ جێگەی شك و گومانن.

"رۆبینس"

863. ئەزموونی ئێمە بریتییە لەو وشانەی بۆ بەیانکردنی ویستی خۆمان کەڵکیان لێ وەردەگرین.

"رۆبینس"

864. گەلی زۆرلێکراو و چەوساوە حەزی لە زانینی مێژوویە، خۆی لە رابردوودا دەدۆزیتەوە، نەک داهاتوو.

"هاوار بازیان"

865. ئەوانەی کەم وشە دەزانن، لە بواری دەروونییەوە لاوازن و ناتوانن هەستی خۆیان بەباشی دەرببڕن.

"رۆبینس"

866. شکست خواردوو، لایەنێکە چاوەڕێی دەرفەتێکی گونجاو دەکا بۆ ئاشتی تا رزگاری بێ!

"هاوار بازیان"

867. بوونی ئامانج لە ژیاندا زۆر گرینگترە لەو دەستکەوتانەی بەشێوەی کاتین و تایبەتی خۆمانن.

"رۆبینس"

868. چاوێك یە بیر و باوەڕەكانتاندا بخشێننەوە و رێكوپێكیان بكەن.

"رۆبینس"

869. دەربڕینی بیروڕای خۆتان بە وشەی سادە و ئاسان لە قسەكردندا، بەهونەری وتەبێژی دادەنرێ.

"هاوار بازیان"

870. رێگە مەدەن شتە نادروستەكانی رابردووتان لە مێشكدا، ئێستە و داهاتووتان وێران بكا.

"رۆبینس"

871. گرینگ نییە چۆن و بیر لەچی دەكەینەوە، گرینگ ئەوەیە چی دەكەین، چونكە كردەوە هاوكات پێكهاتووە لە بیر و كردار، بەڵام بیركردنەوە تەنیایە و ناتوانێ وەك پرۆسەیەكی گشتگیر باسی بكەی.

"هاوار بازیان"

872. ژیان زۆر ناخۆش دەبوو ئەگەر ئاگەداری رووداوەكان دەبووین پێش ئەوەی روو بدەن!

"رۆبینس"

873. تاکە ڕێگەی ئاسایشی ژیان بریتییە لەوەی هەست بکەین بەردەوام لە پێشکەوتنداین و پێش دەکەوین.

"ڕۆبینس"

874. مرۆڤ کەسێکی خۆش دەوێ کە ڕێزی لێ بگرێ، واتە زۆر سادەیە ڕێگەی خۆ خۆشەویست کردن!

"هاوار بازیان"

875. وشەکان توانایان هەیە شەڕێك هەڵگیرسێنن، یان ئاشتییەك جێگیر بکەن.

"ڕۆبینس"

876. کردەوەکانی مرۆڤ چ باش و چ خەراپ هێمای بیرکردنەوەکانی ئەو مرۆڤەن، بەڵام بیری مرۆڤ کە خۆی باسیان دەکا ناتوانێ هەمووجار نیشانەی جۆری کردەوەی ئەو مرۆڤە بێ.

"هاوار بازیان"

877. ئەگەر تووشی ناخۆشییەکانی ژیان نەبین، هەمیشە هەڵگری ترسێکین، وەك ترس لە هەمان ناخۆشی.

"ڕۆبینس"

878. زاڵمی راستەقینە، ئەو زوڵم لێ کراوەیە کە پاش گەیشتنی بەدەسەڵات، خۆی زوڵم بکا و زۆردار بێ!

"هاوار بازیان"

879. هەمیشە مانای سەرەکی لە ئەنجامەکاندا دەردەکەوێ.

"؟"

880. پێویست ناکا گومان لە رەتکردنەوەی پێشنیازێك بکەن کە داوای لەناو بردنی ئێوە دەکا.

"هاوار بازیان"

881. خوداترس بن، بەڵام لە خودا مەترسن! ترس لە دڵی خۆتاندا بێ، نەك لە دیمەنی خودای گەورەدا.

"هاوار بازیان"

882.خۆشییەکان بەیەکەوە و بەدوای یەکتریدا مانایان نابێ، خۆشە ئەگەر دانەدانە دێن.

"هاوار بازیان"

883. مرۆڤ تا نەزانێ خۆی کێیە، ناتوانێ بڕیار بدات پێویستە کێ بێ و چی بێ.

"هاوار بازیان"

884. مرۆڤی زانا و ژیر، هەمیشە وەبیر خۆی دێنێتەوە کە من تەنیا نیم، دنیا هەمووی هی منە.

"هاوار بازیان"

885. مەترسن لەوەی رووی راستەقینەی خۆتان بن، بۆ خۆتان بژین نەک بۆ دەوروبەرتان.

"هاوار بازیان"

886. تەنیا زانینی ئەوەی چی بکەین گرینگ نییە، بگرە دەبێ زانیارییەکانی خۆمان بەکردەوە پێشان بدەین.

"رۆبینس"

887. ژیان، بریتییە لە کێشانەوەی وێنەکان، نەک کۆکردنەوەی ژمارەکان.

"رۆبینس"

888. هەرشتێك واتـان لێدەكا شـەو درانـگ بخـەون و بـەیانییان زوو لەخەو هەستن، ئەو شتە زۆر بە گرینگ بزانن.

"رۆبینس"

889. یاسـا و رێـسای یارییـەكان وا دابرێـژن كـە تـەنیا خۆتـان سەركەوتووی یارییەكە بن.

"رۆبینس"

890. هەستەكان بگۆڕن تا كردەوەكانتان بگۆڕێ.

"رۆبینس"

891. بڕیاری ئەمڕۆتان دواڕۆژی ئێـوە دیـاری دەكـا، هـەروەك چـۆن ئەمڕۆ بەرهەمی بڕیاری دوێنێی خۆتە.

"رۆبینس"

892. گرانترین زام ئەوەیـە هەسـت بكـەی بـۆت نـەكرا بـەپێی بـیر و بۆچوونەكانی خۆت و بەدڵی خۆت بژی.

"رۆبینس"

893. هیچ شتێك لە ژیاندا مانایەکی تایبەتی نییە، جگە لەو مانایەی خۆتان پێی دەبەخشن!

"رۆبینس"

894. هەڵسەنگاندنی باش، دەبێتە هەوێنی ژیانی باش.

"رۆبینس"

895. جۆری بیر و بۆچوونەکانی ئێمە شتێك نین جگە لە جۆری لێکدانەوەی رووداوەکان.

"رۆبینس"

896. نەگەیشتن بەهەندێك ئامانج، زۆرجار دەبێتە هۆی سەرەکی بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی گرینگتر و گەورەتر.

"رۆبینس"

897. بەردەوام چاوەڕێی رووداوی سەیر و سەمەرە بکەن، چونکە خۆتان هەم سەیر و سەمەرەن!

"رۆبینس"

898. بۆ گەیشتن بە سەرکەوتنە مەزنەکان، خۆتان بۆ بیستنی وەلامی "نەخێر و نابێ" ئامادە بکەن.

"رۆبینس"

899. هەر رووداوێك مانا و مەبەستێکی تایبەت بەخۆی لە پشتە کە دەبێ سوودی لێ وەربگرین.

"رۆبینس"

900. لای ئاین، شتە پیرۆزەکان راستن، بەڵام لای فەلسەفە، شتە راستەکان پیرۆزن.

"؟"

901. پێکەنینی منداڵ ئاوازێکە بۆ ئەمڕۆی، پێکەنینی لاو بۆ دوارۆژ و پێکەنینی پیر بەهیوای چەند ساڵێکی تری ژیان.

"؟"

902. من هەڵەم کرد، واتە من هەم!

"؟"

903. لە هەموو شتێك، شتێك بزانە و لە شتێك هەموو شتێك بزانە.

"؟"

904. هەژار ناتوانێ هەڵبژێرێ، هەمیشە بژارەی خەڵکانی تری بەسەردا دەسەپێ.

"هاوار بازیان"

905. دوو زانا ناتوانن لە رێگەی گفتوگۆکردنەوە یەکتری فریو بدەن و فێڵ لە یەکتری بکەن.

"هاوار بازیان"

906. ئەوانەی ئەمڕۆ پەلە دەکەن، کاری رۆژانی پێشتریان لە کاتی خۆیدا ئەنجام نەداوە.

"هاوار بازیان"

907. هەرکەس کۆنترۆڵی رابردوو بکا، باشتر دەتوانێ فەرمان لەسەر ئەمڕۆ و داهاتوو بدا.

"هاوار بازیان"

908. هەژار و نەدار پێش چوونە بازار دەزانێ چی دەوێ و چی بۆ دەکڕێ و لەکوێ هەیە، بۆیە دەستبەجێ دەیدۆزێتەوە و دەیکڕێ، بەلام دەوڵەمەند ماوەیەك لەناو کالاکاندا دەگەڕێ و پەسەندی دەکا، پاشان دەیکڕێ.

"هاوار بازیان"

909. ئەوەی کتێبێکی بەسوود لەناو ببا، واتە پیاوێکی کوشتووە.

"میلتۆن"

910. ئەگەر پیاوێکت فێرکرد، یەك کەست فێر کردووە، بەلام کە ئافرەتێکت فێرکرد، خێزانێکت فێر کردووە.

"فان هست"

911. هەرکەس بە خواردن تێری نەخوارد، دوایە بە لێسینەوەش تێر ناخوا.

"بلژیکی"

912. ئەو پارەی لە دەستتدایە، ڕێگەیەکە بۆ سەربەستی و بێ نیازبوون، بەڵام ئەوپارەی هەوڵی بۆ دەدەی تا بەدەستی بێنی ڕێگەیەکە بۆ کۆیلایەتی و ژێردەستە کردنی خۆت.

"ژان ژاك روسۆ"

913. هەمووومان دەکەوین تا هەستینەوە، لە شەڕدا دەشکێین تا سەرکەوتنێکی باشتر بەدەست بێنین، هەروەك چۆن دەخەوین، بەڵام بە هێزێکی باشترەوە هەڵدەستینەوە.

"؟"

914. هەر دڵدارییەك کۆتاییی پێ هات، لە راستیدا هیچ رۆژێك لە رۆژان دڵداری نەبووە.

"ئەرەستو"

915. ئەی ئافرەت، ئاگەداری ئەو پیاوە بە کە دەڵێ لە تۆ زیاتر کەسی ترم خۆش ناوێ!

"تالێر"

916. کاتێك ئافرەت گریا، پیاو بەرهەڵستیی نامێنێ.

"شکسپیر"

917. هەرکەس رێگەیەکی دووری بۆ ئافرەتێک بڕی، یان هەڵخەڵەتاوە یان دەچێ ئافرەتەکە هەڵبخەڵەتێنێ.

"؟"

918. ئەگەر لە سەردەمی لاویدا کات بەفیڕۆ بدەی، لە سەردەمی پیریدا هەمان کات بە فیڕۆت دەداتەوە.

"شکسپیر"

919. ئەوەی بە توندوتیژی دەتەوێ، بە زەردەخەنەیەک دەستت دەکەوێ.

"سێوارت"

920. کەس ناتوانێ هێندەی خۆت فێڵت لێ بکا.

"گرینبل"

921. ئەو رۆژەی تێیدا پێ نەکەنی، ئەو رۆژەت لە دەست داوە.

"فەرەنسی"

922. ئەو کەسەی بەتەمای خراپەیە، بەر لە هەموو کەسێک خۆی تووشی خەراپە دەبێ.

"ئەڵمانی"

923. دەرگەیەک مەشکێنە کە بە ئاسانی بە کلیل دەبێتەوە.

"هەمزاتۆف"

924. ئێمە زۆر کەم لە شتەکان دەزانین، بۆ نموونە لە زەوی، لە ئێوارە، لە رابردوو، لە ئێستە و لە داهاتوو.

"داروین"

925. دەنگی پێکەنینی ئەو کەسەی شکستی هێناوە، شیرینیی سەرکەوتن لە بەرامبەرەکەی تاڵ دەکا.

"شکسپیر"

926. دەرگەیەك دامەخە کە ناتوانی بیکەیتەوە.

"؟"

927. هەرکەس لە ژیاندا پەلە بکا، ئەوەی لە پاش خۆی بەجێی دێلیّ زۆر زیاترە لەوەی دەیبات.

"؟"

928. ئەوەی رۆژێك شتێکم فێر بکا، بە درێژاییی تەمەنم باوك و گەورەی منە.

"چینی"

929. کەسانێك کە رابردوویان فەرامۆش کردووە، دەبێ بگەڕێنەوە ئەو سەردەم و دیسان تێیدا بژینەوە.

"جۆرج سانتانایا"

930. ئەو دارەی ئەمڕۆ سەری بەرزی دەگاتە ئاسمان، لە دەنکە تۆوێکی بچووکەوە شین بووە.

"لاوتزو"

931. هەرکات لە دنیادا ئـافرەت و خۆشەویـستیمان نەهێـشت، دنیـا دەبێتە گۆڕێکی ناخۆش.

"براونگ"

932. ئەگەر هەموو جیهان بچووك بکەیەوە، دیسان ئافرەت هـەر بـە گەورەیی خۆی دەمێنیتەوە.

"ڤیکتۆر هۆگۆ"

933. ئەوەی هەسـت بکـا لـە ئـافرەت بـەهێزترە، تـەنیا ئـافرەتێکی ترە.

"مارتین"

934. ئەگەر ساڵ هەمووی رۆژی پشوودان و رابواردن بووایە، یاری و خۆشی دەبوو بە یەکەم بێزاری بۆ مرۆڤ.

"شکسپیر"

935. ئەوەی یەك درۆ بکا، دەبێ بیست درۆی تر بکا تـا بیـسەلمێنێ و گومانی سەر یەکەم درۆی لا بدات.

"ئینگلیزی"

936. هەرشتێکی نوێ کە فێری دەبـی، کەسـایەتییەکی تـازەت پـێ دەبەخشێ.

"ئیڤان تورگینف"

937. ئەمڕۆی تۆ دەبێ بە ڕۆژی رابردووت، بەڵام مەرج نییە سبەی بۆ تۆ ببێ بە ئەمڕۆ.

"ئەدیسۆن"

938. هەزاران ڕێگە بەرەو سەرکەوتن دەڕۆن، ئەگەر یەکیان بەسترا، ڕێگەیەکی تر هەڵبژێرە و مەوەستە.

"یورسین"

939. هەرکەس مێژوو بزانێ، هەم لە رابردوودا دەژی و هەم لە ئێستەدا.

"ئالفرد روزنبرگ"

940. هەمیشە وا هەست بکەن پێویست بوو بەشێکی زۆرترتان لە ژیاندا هەبووایە، شایانی زیاترن لەوەی ئێستەتان.

"؟"

941. ئەگەر هەموو بوونت بۆ یەك ئامانج تەرخان بکەی، بێ گومان پێی دەگەی.

"؟"

942. شکست، تەنیا و تەنیا یەك وشەیە و بوونی دەرەکیی نییە.

"؟"

943. هیچ کات دۆستەکانتان شەرمەزار مەکەن و داوای شتی زۆریان لێ مەکەن.

"؟"

944. پێویستە هاورێیەکت بۆ رۆژەکانی بارانی و هاورێیەکت بۆ رۆژانی خۆرەتاوی هەبێ.

"؟"

945. نامەوێ وەك هیچ کەس بچم، چونکە ئەوکات من خۆم نیم!

**"هاوار بازیان"**

946. بۆ ئەوەی بە وەڵامێك بگەی، پێویستە پرسیارێك بکەی.

"؟"

947. هیچ کات بۆ باشبوون درانگ نییە.

"؟"

948. هەندێکجار بێدەنگ بوون لە هەزار ئامۆژگاری سوود بەخشترە.

"؟"

949. ئەگەر ئازارێکت هەبوو، رێگە مەدە خۆت هەم ببی بە ئازارێك بو سەر خەڵکانی تر.

"؟"

950. زۆربەی دەوڵەمەندە گەورەکان، هەمان قەرزدارە گەورەکانن!

"؟"

951. لە هەر سەرکەوتوویەکی ئەمڕۆ بپرسی کام قۆناغی ڕێگەکەت دژوارترین بوو، دەڵێ: یەکەم هەنگاوم.

"؟"

952. بۆ بەرەوپێش چوون هێچ کات درانگ نییە و هیچ کاتیش زوو نییە.

"؟"

953. لە شکستهێنان مەترسن، لایەنیکەم ڕێگەیەکی هەڵەتان تاقی کردووەتەوە.

"؟"

954. لە نێوان بیرکردنەوە و کرداردا مەودایەکی زۆر نییە، هەر ئێستە دەست پێ بکەن.

**"چرچیل"**

955. مرۆڤی ئەمڕۆ بۆ بەدەستهێنانی سبەی دەژی.

**"بێرناند شۆ"**

956. کەمن ئەوانەی بەجۆری مردن بەناوبانگ دەبن، جۆری ژیانی پێش مەرگە ئەگەر بە ناوبانگمان بکات.

**"هاوار بازیان"**

957. ئەوانەی زۆر دەڵێن ناتوانین و کاتمان نییە، لە راستیدا ناتوانن و نازانن چۆن سوود لە کات وەربگرن.

**"هاوار بازیان"**

958. من کە لە بەندیخانەدام دەزانم مانای ئازادی و ئازادبوون چییە و چێژی لێ وەردەگرم.

**"ریچارد لاولێس"**

959. ئەگەر نەزان هۆی نەزانینەکەی بزانێ، ئەوە بە دڵنیاییەوە ژیر و زانا دەبێ.

**"کونوشیوس"**

960. زیاتر حەز دەکەم بڵێن بۆچی رێگەیان نەدا پەیکەرت بۆ ساز بکەن، نەك بەبێدەنگی پەیکەرم بۆ دروست بکەن.

**"؟"**

961. ئەوانەی بەگژ ئازادیدا دەچنەوە، تاقمێکن کە یارمەتیی گەشەدانی ئازادی دەدەن.

**"؟"**

962. دوژمنەکەت لە رێگەی هاورێکانتەوە نهێنییەکانی تۆی بۆ ئاشکرا دەبێ.

**"یونانی"**

963. ئافرەت دروست بووە بۆ بینین نەك بۆ بیستن!

"سوفوكلی"

964. مرۆڤ نە گۆشتی دەخورێ و نە پێستی بەكاردێ، واتە هیچی نییە جگە لە زمانێكی شیرین.

"عزیز نسین"

965. هەموو خۆشەویستییەكەت دەرمەخە، تا ئەگەر هەستەكانت گۆڕانكاری بەسەردا هات، لێت دڵگران نەبن.

"سوقرات"

966. بۆ ژن، یەك پیاو بەسە تا لە هەموو پیاوەكان بگا، بەڵام بۆ پیاو سەد ژن كەمە تا لە یەك ژن بگات.

"برنارد شۆ"

967. چەندان دادوەر دەناسم كە بەزوڵم و نادادپەروەری بڕیار دەدەن، تەنیا بۆئەوەی بەناوبانگ بن.

"عەبدولقاسم ئەمین"

968. دایك نهێنیی كچەكەی بڵاو ناكاتەوە، چونكە خۆیشی لە تەمەنی كچەكەیدا هەمان نهێنیی هەبووە.

"موریس گرسون"

969. دەوڵەمەندە پیس و چاوچنۆكەكان وەك كەر و هێستر وان، بارەكەیان زێڕ و زێوە و خواردنیشیان كاو و جۆیە

"؟"

970. ئەگەر بەرامبەر کچێك بزەت کرد و کچەکە وا تێگەیشت لەوانەیە تۆ خزم و ناسیاری بی و هیچ گومانی لەوە نەکرد ئەو بزەیە بۆ دەربڕینی حەز و خۆشەویستییەك بووە، بزانە کە بەڕاستی پیر بوویە و لاوێتی لە تۆدا نەماوە.

"؟"

971. هەر شەڕێك کە دروست دەبێ، بێ گومان ئافرەتێکی لە پشتەوەیە.

**"ولیام گلبێرت"**

972. هاوڕێیەکەت بە درۆیەك تاقی بکەوە، ئەگەر بڵاوی کردەوە ئەوە نهێنییەکانت لای ئەو باس مەکە.

"؟"

973. بێدەنگەکان بێ ئەوەی ئاڵۆزییەك دروست بکەن، مێژوویەکی جوان بۆ کەسایەتیی خۆیان تۆمار دەکەن.

**"بیرتۆر"**

974. هەرکەس لەناو خەڵکدا نەبێ، ناتوانێ ئاگەداری خەڵك بێ و لەسەر ژیانیان بدوێ.

**"هاوار بازیان"**

975. زۆر ئاسانە بە نەهامەتی و ناخۆشییەکانی خەڵکانی تر پێ بکەنی، بەڵام ئازایەتی و جوامێری لەوەدایە ئەگەر ئەو ناخۆشی و گرفتانە تووشی خۆت هاتن، دیسان بتوانی پێ بکەنی و بە گاڵتەوە شەڕی کێشەکان بکەی.

"؟"

976. ژن لەپیاو پاکترە، چونکە ژن خیانەت بەپەیمان شکێنی دەزانێ، بەڵام لای پیاو جۆرێك سەرکەوتنە.

"ئوگن سیرس"

977. کوڕەکەم کوڕمە تا ئەو کاتەی ژن دێنێ، بەڵام کچەکەم کچمە بەدرێژاییی هەموو تەمەنی.

"نووسەرێکی سکۆتلەندی"

978. زۆر گرینگ نییە خەڵك متمانەت پێ دەکەن یاخۆ نا، گرینگ ئەوەیە خۆت لەگەڵ خۆتدا راست و خاوەن بڕوا بی.

"؟"

979. لە جیهاندا تەنیا یەك کەس هەیە کە لە ژن باشتر بێ، ئەویش دایکە!

"شامس"

980. لەسەرخۆ و بە هێمنی هاوڕێ پەیدا بکە، ئەگەر ناچاریش بووی هەر بە لەسەرخۆیی و ئارامی بیانگۆڕە.

**"فرانکلین"**

981. مرۆڤ سەیرە، لە خۆشییەکاندا دەگری، بەڵام لە ناخوشییەکاندا پێ ناکەنێ!

**"بایکون"**

982. مردن لەگەڵ راستیدا باشترە لە ژیان لەگەڵ درۆدا.

**"ئەرەستۆ تالیس"**

983. هەوڵی فێربوونی هەموو شتێك بدە، تەنانەت ئەگەر لە دوژمنەکەشت بێ.

**"نووسەرێکی ئەڵمانی"**

984. لە هەرجار کەوتندا، ئەزموونێك بۆ چیتر نەکەوتن بەدەست بێنە.

**"هاوار بازیان"**

985. شەرمکردنی پیاو ئەگەر لە جێگەی خۆیدا نەبێ، نیشانەی بێ دەسەڵاتییە.

**"وتەیەکی عەرەبی"**

986. گوێ لە زانایەك بگری زۆر باشترە لەوەی قسە بۆ نەزانێك بکەی.

**"دیل کارنگی"**

987. خۆشەویستیی لاوان لە قووڵاییی دڵیانەوە نییە، بگرە تەنیا لە چاویانەوەیە.

**"شکسپیر"**

988. خۆشەویستی زۆر شتی پێ دەکرێ، بەڵام دارایی و سامان هەموو شتی پێ دەکرێ.

**"نووسەرێکی فەرەنسی"**

989. نەزان دوژمنی خۆیەتی، ئیتر ناتوانێ ببێ بە هاوڕێی یەکێکی تر.

**"ئەرەستو"**

990. ناخۆشترین خەفەت لە کاتی ناخۆشیدا ئەوەیە، دیمەنی ڕۆژە خۆشەکانی ڕابردوومان بەیاد بێنەوە.

**"دانتە"**

991. نابێ هەرچی دەیزانی بیڵێی، بگرە دەبێ بزانی چی دەڵێی.

**"کلودیۆس"**

992. تەنیا ڕۆژانی سەختی شەڕە دەتوانێ نەتەوە و گەلان بە ئاگە بێنێتەوە.

**"لۆرد ولتۆن"**

993. پەیکەر لە بەفر دروست دەکەین و پاشانیش گلەییمان هەیە کە بۆچی وا زوو دەتوێتەوە!

**"سوقرات"**

994. پێویستە زمانی بزە لە فرمێسك فێر بین، چونکە ژیان هەمووی بزە و فرمێسکە.

"؟"

995. پیاوان دەڵێن زانست هێزە، بەلام ژنان دەڵێن جوانیی بەهێزترە.

"شیلدن"

996. زۆرجار هیواکانمان وەدی نایەن، لە هەموانیش خەراپتر ئەوەیە هیواکانمان بەردەوام لە زۆربووندا بن.

"شکسپیر"

997. تۆ خۆت جوان بە، جیهان بە جوانی دەبینی.

"ئایا ئەبومازی"

998. فرمێسکی منداڵ سەرەتا پاڕانەوەیە، ئەگەر وەلامی خۆی نەدەیتەوە دەبێ بە ئەرك و فەرمان لەسەرت.

"روسۆ"

999. یەکەم خۆشەویستی لەلای پیاو شەرمە، بەلام لەلای ئافرەت بوێرییە.

"ڤیکتۆر هۆگو"

1000. هەموو کەس دوژمنەکەی خۆی بە شەڕخواز و دوور لە ئاشتی ناو دەبا.

"نووسەرێکی ئینگلیزی"